شعر

# كورسيكەك ل ناڤ بەفرێ

## گولبژێرەك ژ هەلبەستێن شاعر و چیرۆكنڤیس

## ماجد الحيدر



وەرگێڕان ژ عەرەبی

عارف حیتۆ

شعر

# کورسیکەک ل ناڤ بەفرێ

گولبژێرەک ژ هەلبەستێن شاعر و چیرۆکنڤیس

"ماجد الحیدر"

وەرگێڕان ژ عەرەبی

عارف حیتۆ

ناڤێ کتێبێ: کورسیکەک ل ناڤ بەفرێ
بابەت: شعر
نڤیسەر: ماجد الحیدر
وەرگێڕان ژ عەرەبی: عارف حیتۆ
دەرهێنانا هونەری و بەرگ: عبدالرحمن بامەرنی
ژمارا سپاردنێ: (D-/2510/25) ژ پەرتوکخانا بەدرخانییان- دهۆك
تیراژ: ٥٠٠ دانە
چاپ: چ1، چاپخانا گازی، دهۆک- ٢٠٢٥.

# پێشگۆتن

وەرگێڕانا شعرێ موغامەرەیەکە د دەقیدا دهێتە کرن و وەغەرەکا ئەسیرییە د ژیانێدا، ب نەمازەیی ئەگەر شعر هەڵوەستەیەکێ تێگەهشتنا ژیانێ بیت. ژیان ب هەمی سەربۆرێن خوە یێن مشت دەردەسەریڤە، کێلەکا ڤەداییە و شاعر ل شوینا تیران، گولان بەرددەتێ، بەلکو ڕەزێن خرابەکری و بیستانێن کولی ل هنداڤ، بکەتە قیبلەیەکا پڕ شەهوەت و هەڤشییەکێ محەبەتێ. ما شاعرێ شاعر چ دڤێت؟ ئەگەر هەسپێن خوە ژبۆ وەغەرێن دوور و نەدیار زین نەکەت، ئەگەر دەرگەهێن گرتی ل خەریبیێ ڤەنەکەت. ئەگەر پرچا گژاڤژا خوەشیێ نەڤەهوینیت و شەنەکەت. ئەگەر ل بەر پەنجەرکا سیدۆرایێ مەست نەبیت و قەبخواستنا گلگامش نەکەت. ما شاعرێ شاعر دێ کیڤە هێت؟ ئەگەر دلەکێ ب ژان هاویش نەکەت، ئەزەکێ بەرزەبوویی دگەل خوە نەبەت و مینا فریزێ هار خوە ل دەرازینکێن مالان ڤەنەدەت. ئەگەر هەستێن من و تە، خەمێن کورکبوویی یێن ل بەر دیواران، گرنژینا ئەڤینداران و خەونێن سواران ڤێ نەبن، بلا نەهێت.

هەر ژ زارۆکینیێ، من خوە ل ئاڤێن بەزەک ددا بێی کو مەلەڤانیا بزانم، ئو نە خەندقیم. لێ هندەک بیرەهی یێن شەهی و سەرنجراکێش دبوونە خەتیرێن هەلکری و من سترانێن شاهیا ژیانێ ژبۆ موغبەرێ دگۆتن. هەکو ڕووبار د حال دچوون و پەراڤێن خوە دخوارن، من ب وێ ئاڤێ دەستڕویڤەددا و نڤێژێن سادە ژبۆ ئاهۆرایێ خوە دکرن. هەکو تۆپان خانی و جنیکێن مە دچنین، ئەز سپیکوترەکا رەڤەند بووم، چقەک زەیتوونێ ب دمیڤە و سترانێن

دادانێ دلۆرانـدن. ئەز ئەوێ ل تاریسـتانێ تەڕ ب پەیڤـان و ڤەچغانـدی ژ هۆڤان، نەگەهشتمە میرگەها ڕێژگەها و ڕازێن خلوەتگەها. هەرچەنـدە عەرد یێ گەرمە و ئاخا شعرێ یا هشکە... لێ حەزەکا دژوارا لێگەڕیانێ ل خەزالەکا جوان و تەنگەزار ل چۆلاهی یێن مشتانەکری یێن "ماجد الحیدر" ڕاوەسـتاندم و برمە ناڤ بیرەکا کوور و کرمە کەڤـرەک ژ وی چیایێ سـێ چارێکێن وی ل بن دەریایێ ڤەشارتی. مـن نـاڤێ خـودێ ئینـا و خـوە ب وەریسـێ وەرگێڕانـا پەیڤێن گەڕۆکڤە بەردا نێڤ نهالا پڕاوپڕ ژ گولئاسمینێن نخافتی.

ما ئەگەر وەرگێڕان نەبایە، دا چەوا ب ڕێـڤە ئەنکیـدۆی بیـنم، یـان دا چەوا ل جڤاتا لینینی ڕوینم و تەراتیلێن ئەنلیلی تەوینم، ما دا چەوا دون کیخۆتە هێتە د جانێ مندا و چەوا دا وەغەرێن فێرسێن نەدیتی دۆمینم. ئەز ژی شـاعرەکێ موغامەرەچیمە، لێ ئەڤە نە شعرە هەڤاڵنۆ، وەغەرەکە دناڤ مێرگـا شـاعرەکێ کوردێ ب عەرەبینڤیس، ددرکینم.

ماجدێ حەیدەری، شاعرەکێ ڕاستگۆیە دگەل پەیڤـان و شـەیتانێن هەسـتەکا ئازراندی، هەلچوونان هاویش دکەت و دیتنان ژێ دبشـێڤیت. نـێ ئەو تیپـان ناڤەهوینیـت کـو ڕسـتکێن شـعرێ ژێ چـێکەت، ئەو دیتنـان دنڤیسـیت و ژ قەفەسکێن چاڤێن مەژی بەرددەت. ژبۆ هەر دیتنەکێ خـوە بەرددەتە دنـاڤ جەرگــێ مرۆڤایەتیێــدا کــو کەڤــاڵەکێ ڕەنــگ گەرم و هەژی هێڤکرنـــێ بنەخشینیت. ئەو خەونان ژ کەتواری دچنیت و د مەشکەکا جادۆییـدا دکێـت هەتـاکو نیڤشـکێ دیتنەکـا ئـاڤەرتەیی ژێ دڕژینیـت. وەلاتـێن ئەندێشـەیی دشەقینیت و پەیڤێن خوە، د میحرابا پەرسگەهێن شەمەتەییدا دگۆگرینیـت و ل سەر زویرکێن وەلاتەکێ خۆشەڤی دروینیت، ئاسمانێ وی ب کەسکەسـۆری خەملاندییە. ئەڤرۆ یا شعرێ ژ هەردو لایێن وێڤە دکێشیت، لایەکی دگەهینتە رابـردووی و لایـێ دی دگەهینـتە پاشـەڕۆژێ کـو هەرسـێ ب هەمـی خەم و خەون و خەزانی و خلماشیێڤە دبنە خێزەکا خوڕستی ژبـۆ دارەکـا ڤیـت ل بەر

لێڤا ڕووبارەکێ هشک نەبیت. هەر شعرەک ل دەف وی وەغەرەکە و هەر وەغەرەک دیتنەکە و هەر دیتنەک چیرۆکەکە، لەوا جارنا شعر ب جلکێن چیرۆکێ دهێنە دیتن و چیرۆکێن وی ژی ب گولێن شعرێ دخەملاندینە.
ئەڤ گیانێ ناڤێ (ماجد الحیدر) ل سەر، ل بازێرێ بەغدا چاڤێن خوە ڤەکرینە سەر دنیایەکا مشت هەڤڕکی و خوین و ئەڤینی. د تۆلازییا خوەدا، بۆ دەمەکێ نەکورت، هاتییە مالا برایێ خوە ل دهۆکێ داکو چاڤێن وی ب کۆمەکا دێمێن خەمگین و وەستیایی و داخێن سەتمینا شۆڕەشا ئیلۆنێ بکەڤیت و بەر ب جیهانا شعرێڤە بهێت. کولیژا نۆژدارییا دادان ل زانینگەها بەغدا ب دوماهی دئینیت و دکەڤیتە دناڤ داڤێن جەنگا چەپەلا عیراقێ و ئیرانێدا. شەش سالێن عەسکەریێ ب هەموو ووردەکاری یێن خوە یێن مشت ژ دەردەسەری و کۆژان و غەریبیڤە، باندۆرەکا مەزن ل سەر شعر و چیرۆک و پەخشان و بەرێخوەدانێن وی یێن ژبۆ ژیان و مرۆڤایەتیێ کرییە. ب سێ زمانان دنڤیسیت (کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی)، هەروەسا بۆ و ژێ وەردگێڕیت ژی. ژ بلی یەک کتێبا زانستی و ئێکا فولکلۆری، هەمی بەرهەمێن وی یێن نڤێسی- و وەرگێڕای شعر و چیرۆکن. هەر ژ سالا (٢٠٠٦)ێ وەرە، هاتییە دهۆکێ و پشتی خانەنشینیێ دەمێن خوە ب خواندن و نڤیسین و وەرگێڕان و گوهدانا میۆزیکێڤە دبۆرینیت. هەتا نهۆ بیست و حەفت بەرهەمێن چاپکری هەنە، د بیاڤێ شعرێدا، هەشت کۆمەڵە شعر، دوو ب زمانێ ئینگلیزینە و هەشت بەرهەم ژی ژ کوردی و ئینگلیزی وەرگێرایینە سەر زمانێ عەرەبی. د بیاڤێ کورتە چیرۆکا هونەریدا، پێنج کۆمەڵە چیرۆک هەنە، ئێک ژێ ب زمانێ کوردییە و دو کۆمەڵە چیرۆک ژ زمانێ کوردی هاتینە وەرگێڕان.
هەڵبەستێن وەرگێڕایی یێن ڤێ کتێبێ ژ هەر شەش دیوانێن وی یێن ب زمانێ عەرەبی هاتینە وەرگرتن؛ (النهار الأخیر، بغداد- ٢٠٠٠، مزامیر راکوم الدهماء وقصائد أخری، بغداد- ٢٠٠٢، ناجون بالمصادفة، دهوک- ٢٠٠٩، غلطة من

هذه؟ دهوک- ۲۰۱۵، کف عني یا فیثاغورس، دهوک- ۲۰۱۹، بلاد تخاف المطر، بغـداد- ۲۰۲۲). ژ هەر دیـوانەکێ چەنـد شـعر ژێ هـاتینە هەلبـژارتن کـو قۆناغێن ژیانا شعرییا شاعری پـێ بەرجەسـتە ببیـت و وەرگـر خوەشـییەکێ ژ هەست و دیتنێن سەردەمێن جوداجودا یێن شاعری وەرگریت.
من ب مجدی هەولـدایە پارێزگـارییێ ل سـەر ڕامـانێن ڤەشـارتی و خویـاکری بکـەم، د هـەمان دەمـدا، خاڵبەنـدی و شـێوازێ دانانـا هـەڤۆکان و پیتـان و ڕوخساریێ گشتییێ هەلبەستێ ژی بپارێزم، بەلکو بشێم ب کوردی دەربڕینـێ ژ میناکێ تەصـویکرییێ د ئاشـۆپا شـاعریدا بـکەم. لـێ هنـدەک جـاران نـەچار بوویمە کو هندەك پێشگر و پاشگران دانێمە سەر هندەك هـەڤۆکان یـان ژی هەڤـۆکێن دەربڕانـدی پاشـوپێش بـکەم داکـو دگـەل ڕێزمانـا زمـانێ کـوردی بگونجیت. ژبـۆ ڤـێ چەنـدێ ژی، بەری بەلاڤکرنـێ مـن بـۆ شـاعری ب خـوە هنـارتن کـو پێـداچوونەکێ تێـدا بـکەت و ل گەل دەقـێن سـەرەکی هەڤـبەر بکەت. ب ڕاستی من مفایەکێ زۆر ژ تێبینی یێن شاعری دیـتن و ئەز ژ شـاش تێگەهشتنا هندەک تێرمان و ڕامانێن ل پشت پەیڤان ڕزگارکرم.
هەرچەنـدە ئەڤ شـعرە ب زمـانێ عەرەبی هـاتینە نڤیسـین و بەلاڤکـرن، ئـو دبێژن کو زمانێ دەقی مولک و ڕەنگڤەدانا زمانێ وی جڤاکییە یـێ دەق پـێ هاتییە نڤیسین. لێ بێهنا جڤاکێ کوردەوارییێ ژ ڤان دەقێن وەرگێڕایی دفڕیت و سیمایێ دۆز و خەم و خەونێن کوردان پـێڤە ددیـارن. لەوما مـن ڤێیـا ژبـۆ خواندەڤانێن پەیڤا کوردی پاچڤەکەم داکـو دیـتن و دەربـڕینێن شـاعرەکێ ب عەرەبینڤیس ب کوردی دانێمە بەر دەستێ ڕڤێشتێ کوردیخوین. هیڤیدارم ب دلێ خواندەڤانان بن.

# من بزڤڕینە گەنجاتیا من

من بزڤڕینە گەنجاتیا من

من دڤێتن،

وان چەوتی یێن خوە یێن جوان دوبارەکەم!

دەرفەتەکا دی بدە من، دا دەمێ خوە

دناڤ سینگێ یارا خوە و کتێباندا بەرزە کەم

بهێلە جار ل دویف جارێ بهەلنگڤم و

دۆڕاندنێ بجێرییینم

من بهێلە ل گەل ئەحمەقی یێن من یێن ب لەززەت:

عەشق و

خەون و

چاڤەرێکرنا ئەستەمێ

بهێلە تا دەمێ نیڤرۆ نڤستی بم

وانە ژ من بچن.

بهێلە پاسپۆرتەکا نوو وەرگرم و

جاردی بدانمە،

د کوژییەکێ چەکمەچییەکا ژێبرکریدا

ب رەخ هەڤالێن ویڤە دانێم

هاری من بکە جاردی کارکەم

ژبۆ تێرکرنا زارۆکان

ئو من بکە قوربانیا خوە،

د تێرامانا دێمێ تەدا

رۆژ و کاژێران ببۆرینم!

***

أعدني الى صباي. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص٢٩-٣٠.

# سترانەك د ڤاييشا سەكەراتێڤە

ما دێ چ ل سێڤێ کەم؟

نێ ددانێن من یێن کەفتین

ما دێ چەوا خوە چەمینم

کو بێهن کەمە،

وان گولێن تە بۆ من ئینایـن

پشتا من یا ڕەقە و کێنجگرتییە؟

چ کەڤالێن رینواری[1] نیشا من نەدە

هەردو چاڤێن من یێن سپی بووین

چ قاونێن کێم و نایاب

---

[1] رینوار (Renoir): پییێر ئوگۆست رینوار (١٨٤١- ١٩١٩)، نیگارکێشەکێ فرەنسییە، ژ ئالاهەلگرێن رێبازا ئیمپرێشینزمێیە (الانطباعیة)، وی گرنگی ب رەسمکرنا ژێومرێن مرۆڤان و دیتنێن ژ ژیانا گشتی یا خەلکی ددا.

ژ وێ سترانا من ل گەنجاتیێ دئەڤاند، نەهنێرە

چونکو نۆکە، ئەز پێ کەڕم.

ما دێ چ ل قەهوا سپێدێ کەم

ئو ئەز پێ ل داوییا شەڤێ؟

نهۆ هەرە و دەرکەڤە ناف ڤێ دنیایێ

وەلێ ئەگەر، دەرفەت ل قاییشا شین هەلکەفت

سۆزێ بدە من، ڤەگەڕییەڤە

بەلکو ژبۆ جارا دوماهیێ

دەستێ من ب دەستێ تە بکەڤیت

پەند درەون...

ئەگەر نەهێێ

باشترە ژ وێ، درەنگ بهێێ!

***

أغنية [illegible] المحتضرين. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص٣٧-٣٨.





## سترانەك ژبۆ خودانێن سەرێن ڕەش[2]

**- "ژ مە ڤەبن..**

**ئەم ب ڕێکا دۆزەخێ دکەڤین"**

ئەوێن نفستی ب ڕێڤە دچن

مینا رەفێن ژ کولی یێن مەست، دبسترن.

**- "کێفەراتا مە و یا هەوە.. بێهۆدەیە"**

وەک دەرویشان ب بازنەیی خرڤە دبن و

ل دۆر خوە دزڤڕن...

هەر دزڤڕن و دزڤڕن و دکەنە ڤیژی:

**- "نها حەق دیار بوو[3]**

**بێ مفایە!"**

......

---

[2] د ئەدەبیاتێن سومەریدا، خوداڤەندان ناڤێ خودانێن سەرێن ڕەش ددانا سەر مرۆڤان

[3] ئاماژەیە بۆ سۆرەتا یوسف: "الان حصحص الحق....."

**- "مە ب لەزگینی بنگۆڕ بکەن**

**مە بنگۆڕکەن**

**خۆ ئەگەر ئەم هێژ نە مر بین!"**

ئەوێ فرچێ ئەبەدیێ د دەستاندا، لێ ڕادمینیت:

**- "د کەڤالێدا تشتەکێ هەی گومانکییە:**

**ئەرێ ڕەنگ کیڤە بەرزە بوون؟"**

**- "ئەرێ بۆچی رۆژ یا سارە؟"**

باژێر پرسیار دکەن.

بەرێ یێن دی دکەڤمە سەر چۆکا و چاڤێن خوە دنقینم:

**- " ل دوماهیێ، ئەی شەبەنگا دایکا من..**

**دێ دەستێ من گری و**

**دێ من بەیە هندەک باغێن ژێرکری و**

**ب مژ و مۆرانێ دخەندقیت!"**

***

أغنية لأصحاب الرؤوس السود. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص٣٩-٤٠.

# خوەکوشتن

ل بیرموەریا (حاکم گوران) ئەویَ ل بەرانبەری پەخشکرنەکا زێندی، ژبەر ژ دەستدانا خەونان، دوماهی ب ژیانا خوە ئینای.

- نێزیک نەبن!

ل ئەوێن دەردۆر دکرە هەوار

- نێزیک نەبن.. من دڤێتن ب تنێ بمرم!

مینا قولنگەکێ سەربەست

ب تنێ ل سەر ڤێ چیای بمرم

ئەڤجا هەڕن، نێزیک نەبن...

تبلا خوە، ل سەر جەلەبکێ شداند و

پاشڤە پەشی

ل سەر کەڤرەکێ

وی چیاێ وی ڤیای نفست

ئەو چیاێ ساری و بەفرا وی ژ بیرکرین

گیا و

شکەفت و

باڵندەیێن وی ژ بیرکرین

ڕێ و زنار و بێهنا ئەوێ خوینا

ل سەر هاتییە ڕێژتن ژێ، ژ بیرکرین

هەر ژ وی دەمێ ژێ دابەزین،

د تەلارانڤە دژین و

تەڤ دەرگەهـ یێن قفلکرین

وەلاتێ من.. وی ژبیر بکەا

***

انتحار- من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص٥٩-٦٠.

# وەڵاتەك ژ بارانێ دترسیت

ل وەڵاتێ من

خەلک ب بارانێ دلشاد نابن

لێ خوە ب دلشادیێ دئیننە دەر

ژ ترسا هندێ نەکو کەرب و

توورەبوونا پفکەرێ عەوران بئارینن

ل وەڵاتێ من

خەلک ل بەر بارانێ نا لەیزن

لێ دکەنە غار

خوە ل پشت پەنجەرا دپارێزن

ڕوویێن خوە ب مژا وێڤە،

دنووسینن و

ب بوغومیێ هێڤ دکەن.

یان ژی دبیتن، وەکو من،

بەرگرییا خەوتەییا خوە دکەن

مرێ و

سەرباز و

ئەوێن ل چۆلاهیێ جهوار

دناڤ تەقنێدا دخەندقن

یێن شاعر ژی،

چ یا ژ سەییابی[4] ل بیرێ مای

بۆ ڤەدگێرن

باران تەقنێ دئینتە بیرا من

تەقن ئاخێ و

---

[4] سەیاب: شاعرێ عیراقی بدر شاکر السیاب (١٩٢٦- ١٩٦٤)، ل گوندێ جیکۆر- پارێزگەها بەسرا ژ دایکبوویە. ئێکە ژ دامەزرێنەرێن هۆزانا سەربەست د شعرا عەرەبیا و شاعرەکێ ناڤدارە ل سەر ئاستێ هەمی وەلاتێن عەرەبان.

ئاخ ژی گۆڕان

باران بڕویسیا دئینته بیرا من

بڕویسی بۆمبەیان

بۆمبە جەنگێ و

جەنگ ژی مرنێ

ئەو پەندیارێن..

کتێبێن خواندنگەهان ددانن

پێ تێکدچن

ژ تۆڤێ یاخیبوونێ دترسن

مە نەچار دکەن

هەروەکو دناڤ پیشاندانێن حکومیدا،

بکەینە هەوار و گازیکەین

باران یا ب مفایە..

مفادارە باران

ئەز ژی بلەز خوە دخویسینم

مینا ئەوێن دی، ژێ درەڤم

هەرچەوا بیت، نەیێ توندم..

دبێژمێ: سوپاس و

ڕوویێ خوە ژێ وەردگێڕم.

***

بلاد تخاف المطر. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص٦١-٦٣.

## بالۆرەیەك ژبۆ دیوارێ بەری

ئەی دیوارێ قیت و بلند

ئەی دیوار.

کونەکا بچووک بۆ من ڤەکە

دا لایێ دی تێڕا ببینم

دبێژن، هەیهۆ دیوارۆ ئەزبەنی

جارەکێ تو مەست ببووی و تە یا کری:

تە پەنجەرەک ل خوە ڤەکر بوو

بابکالکەکێ من تێڕا بۆری بوو

لێ ب دەردێ خەرییێ نەخۆش ببوو

ب دزیکیڤە ڤەگەڕاڤە

دا دلبەرا خوە دگەل خوە ببەت

لێ دیوارۆ

هەرچەند سەرێ تە مشت بەرە

وەلێ هەکو تو هشیار بووی

تە فتێلا وی ساویلکەیێ خویا کر و

ئەو ل ڤێرە ما هەلاویستی

پاشی شێت بوو و ئەم ئەڤێن هە

هەمی ژێ بووین.

دیوارۆ خوە دلۆڤانکە

من کۆمەک زارۆکان هەنە

هەرشەڤ خەونان،

ب وی جهێ ل پشت تە دبینن.

تو خودێکەی دلۆڤین بە و مەست ببەڤە

جارەکا دی، ئەوێ کریارێ بکەڤە!

***

ترنيمة للجدار الحجري. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص٦٧-٦٨

# شیرەتا وی کالێ هەردو پێ بڕی

کوڕێ منۆ وەغەرێ بکە

تە دل ب منڤە نەبیت

مادەم تە پێ هەنە،

وەغەرێ بکە!

ژ وی وەلاتی مشەخت ببە

کو مەزنترین هیڤییا ڤی مرۆڤی

ئەو بیت سالەک..

یان دو سالان

یێ بێ جەنگ بیت.

یان کۆمەکا گۆڕێن دەف ڤەکری

ل بەندا کوشتی یێن ب هەروە بیت!

کوڕێ منۆ

وەغەرێ بکە

ل کوژییەکێ ڤێ عەردی بگەڕێ

بێ شمشێر بیت

یان بێ گازییا شەڕەکی بیت

یان بێ دەنگێ بانگدانێ بیت.

***

نصيحة العجوز المبتور الساقين. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص٩٠-٩١.

# هایکۆیێن پاییزی

(۱)

دو چپک ژ بارانێ

چپکەک ژ ڕۆندکێ

کوچکێ پاییزێ تەڤاڤکر

(۲)

چانتایەکا گران

تەقن و زکەکێ ڤالا

چوونا خواندنگەهێ

(٣)

"هوون بخۆن

ئەز یا تێرم"

دایک درەوا دکەن

(٤)

"نەخێر، نە ژ ترسێیە، ژ سەرماییێیە،

یان ژی، دبیت خوینبەربوون بیت

سەربازەکێ بریندار

(٥)

چ چووچک ل سەر داران نینن

چ چووچک ل ئاسمانی نینن

تفەنگا نێچیرێ کەچ ناکەت

(٦)

١٩٦٠....

.٢٠٢٠

شێست پاپۆرێن ڕەشەیان

شێست قۆرتالبوونێن ب سودفە

(٧)

یێ ئەگەر ڕۆندک دبارن

چاف..

بۆ خوە دکەنە گری

(٨)

وەرزێ دوریێ گیرۆ بوو

گولی یێن زەربوویی دلشاد بوون

ل گەل بای کەفتن سەمایێ

(٩)

"یا ژمنڤە داوی پاییزە

یا ژمنڤە خەرزێ داوییێ بوو"

تڤیرکەکا ڕازایی دگۆت

(١٠)

تۆڤێ روحانێ شین نەبوو

چووچکان دابلعاند و فڕین

خوە وان نەگۆتن سوپاس ژی

***

هايكوات الخريف. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص٩٥-٩٨.

## ئەگەر من ماف هەبا...

## بەهەشتا خوە بهەلبژێرم

ئەگەر من ماف هەبا،

بەهەشتا خوە بهەلبژێرم

دا دانێمە ناڤ گوندەکێ ژبیرکری و دوور

دوور ژ هەمی ڕێکان

بێ داقوتای ژ هەمی تشتان

ژ بلی هندەک خانی یێن بچووک

خانی یێن پاقژ و بچووک، ژبۆ دۆستێن من

ژبۆ من ژی مالەک بچووک

(ب ئۆدەیەکا هەژی ژبۆ مێڤانان و

بەخچەیەکێ بێ پەرجان بیت)

ئەز و هەڤژینا خوە لێ بین

**ئو پەرتوکخانەکا مەزن**

کتێبێن وێ، هێدی هێدی، هەمیا بخوینم؛

ئەبەدیەت ب هەمیڤە ل بەر منە

بەلێ، صەیەکێ بچووک ژی

یان جووتەکێ صەیان

ئاها.. بەری ژبیرکەم:

جووتەکێ کیسەلێن پەندیار و ب ئەزمان

سپێدەهییان ل ناڤ بەخچەی دێ کار دکەم و

ل لێنانگەهێ، دێ هاری هەڤژینا خوە کەم

ل ناڤبەرا هەر خۆلەکێ و ئێکا دیدا، دێ ماچیکەم

ل ئێڤاریان، دێ ل گەل هەڤالێن خوە ڕوینم

دێ مەیا هەر جار ڤەخۆین و

جگارەیان ب زێدەڕۆییڤە کێشین

ل ڤێرە، چ ترس ژ تووتنێ نینە!

دێ سوحبەتان کەین و

دێ ب ساویلکەییا خوە یا کەڤن و

خەونێن سڤک.. کەینە کەنی

گەلەک گەلەک، دێ گوهدەینە میۆزیکێ و

وان تەڤ سترانێن ژ مە چووین

جار جارە دێ

سەرەدانا دۆزەخێ کەین

دێ ل هەر تشتێ خەلکێ وێ خوەش بین و

لێبۆردە بین

بەس ئەگەر من مافێ بژارتنێ هەبا

گەر من هەبا..!

***

لو كان لي أن أختار جنتي. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص١٠٨-١١٠.

## گرنژینا وێ زارۆکا کوورە

کچا منێ.. یا مە دیتی تە نەدیتییە

لەوا هەردەم تو دگرنژی

زارۆکا من.. یا دێ بینین، تو نابینی

ئەڤجا بکەنە و ڕۆندکان ژبۆ مە بهێلە!

تە دایکا هەی، پرچا تە شەهکر و ماچیکری

وەلێ یا ئەم.. تەڤ هێتیم و سێوینە

کی ژ مە بەدبەختە کچا من

کی حەسوودە و کی مەحسوودە؟!

***

إبتسامة الصغيرة العميا‌ء. من ديوان (بلاد تخاف المطر- ٢٠٢١)، ص١٢-١٣.

# دێ من کیڤه بەن؟

- دێ من کیڤه بەن؟

ئەو گەنجێ پووتیێ سزادای ب سێدارەدانێ پرسیار دکەت.

- دێ من کیڤه بەن؟

ئەو بچووکێ دکرنه د سندۆقا پشتێدا

ژ رەڤاندەیێن خوه پرسیار دکەت.

- دێ مه کیڤه بەن؟

خوەپیشاندەرێن دوورپێچکری پرسیار دکەن.

- دێ من کیڤه بەن؟

ئەو هەسپێ پیرێ کوورە بووی، پرسیار دکەت.

- دێ مه کیڤه بەن؟

ڕووبار پرسیار دکەن.

- دێ وی کیڤه بەن؟

هەکو وان سندریک

ب سیپایێ پاصا ل سەر چوونێڤە دبەست

دایک پرسیار دکەت.

- دێ من کیڤە بەن؟

ئەو وەلاتێن سەبیکری پرسیار دکەن؟

....

- بەرەف کیڤە..

بۆ کیڤە

د چۆلاهیێا فرەهدا دەنگڤەدان

دەنگڤەددەتا

***

أين تاخذونني؟ من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩)؛ ص١٣-١٤.

# ئەو ئەوە یێ دیتی

ئەو ئەوە یێ خڕ تشت دیتی[5]

لێ ئەوە ب کوورەییێ دئینادەر

چونکو گەهشتبوو بێهۆدەییێ

...

ئەو ئەوە یێ گەهشتییە بێهۆدەییێ

لێ وی پێڤاژۆ هەر دۆمکر

داکو ج یێ، یێ لێ نەنێن

...

ئەو ئەوە یێ جەماوەری یێ لێدانای

لێ خۆ ئاهەک، ژێ دەرنەکەفت

---

[5] ئەڤ دێرە ئاماژەیە بۆ دەستپێکا داستانا گلگامش: داستان ب ڤێ هەڤۆکێ دەست پێ دکەت: "ئەو ئەوە یێ خڕ تشت دیتی. وەلاتێ من ژێ ئاڤێ وی ببستره....."

چونکو ئەوان گوھ لێ نابیت.

...

ئەو ئەوە یێ شویرهێن بلندێن (ئوروٚک)[6]ێ

نژاندین و ژێ رەڤی...

دناڤ خیزیدا بەرزە بوو

...

ئەو ئەوە یێ دیتی و گریای،

گوٚت خوٚزی من قەت نەدیتبا

...

وەلاتوٚ.. وی ژبیر بکە!

***

هو الذي رأى؟ من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩)؛ ص٣٣-٣٤.

---

[6] ئوروٚک (Uruk): بازێرەکێ کەڤنێ سەردەمێ سوٚمەری و بابلییانە ل سالا (٤٠٠٠ ب. ز) هەبوویە. ئڤیسین ل ڤی بازاری هاتییە ئافراندن و داستانا گلگامشی ژی لێ پەیدا بوویە.

# خرخرا ئودیسیۆسی

ئەز ئودیسیۆسێ[7] بێزارم

ئەڤە جارا هزارێیە، داستانا خوە دخوینم و

وێنێن کەڤن دبژینمە سەر تەختێ

وەردگێڕم و چ تشت ناهێتە بیرا من

ئەڤجا گوهددەم هاواران و ڤلڤلیێ، شیرەتان و پێکۆتنان

بەس پا دبیت.. ژبەر پیرینێ، یان ژ گوهگرانییا من بیت

چ تشتەکی نابهیسم.

...

کەواتە هۆیە لاوێ من..

[7] ئودیسیۆس یان ئۆلیس (Ulysse): شاهێ ئیتاکا ئەفسانەیی بوو، وەلاتێ خوە هێلا داکو پشکدارییێ د شەڕێ یۆنان و تەروادەییا بکەت. ئەو خودانێ هزرا هەسپێ داری بوو کو تەروادەیی پێ شکاندین. ل دەمێ زڤڕینەڤێ بەرزە دبیت و دەربەدەری دنیایێ و دەریایان دبیت. لێ هەڤژینا وی (پینیلۆپی) د مینتە ل هیڤیێ و ژ ڤەگەڕا وی بێئومێد نابیت.

نه ئەزم یێ ب تنێ، نابینیت و تێناگەهیت

ب بێهنا بخوڕێن میحراباں سەرخۆش نابیت.

وەلێ پا ئەز..

وەک مەشیارێ د هۆشیارییا خوەدا دمەشیت

ئەز ژی دۆلکێ خوە یێ ژەنگی

دێ هاڤێم بیرا ئەبەدێ[8]

دێ سەحکەمە ئاڤ و تەقنا ژێ پەشاندی و

کرمۆکێن وێ یێن خافوخڕچ

ئو دێ بێژم ئەڤە باشە..

گەلەک باشە!

...

جار ل دویف جارێ

د توندی و بێدادییا خوەدا،

ئەوا ژ نەڤ یێن من بۆ من مای

ڤێ پەرتووکا کەڤن ژێ دبەم

---

[8] وەکو وێیە هەکو د کوردەوارییێدا دبێژن: "دێ خوێیا خوە کەمە ڤێ گرارێ".

ل دوماهیيا هەر هەفتیێ دنڤیسمەڤە

یێ پشتڕاستم ژ پەنوەری، ژ جوامێری و چاڤتێژیيا خوە.

خوە ژ شێتیێ و ساویلکەییێ

ژ گێلیێ و زۆرداریێ

ژ چننەیی و پەیڤدرییێ،

بێتاوان و بەری دکەم!

...

کوڕێ منۆ.. تلیماخۆس[9]،

ئەم دهۆساینە:

مللەتەکێ ڕکۆیینە و ب زەحمەت دهێینە هاژۆتن

لێ دەمێ مەی...

یاریيا ب سەرێن مە یێن بچووکێن گەور دکەت

وە هزر دکەین کو پاسەوانێن تەلیسێ باگەڕاینە[10]

---

[9] تلیماخۆس: کوڕێ ئودیسیۆسییە، ئەو هێشتا ساڤا بوو هەکو بابێ وی چوویە شەڕێ تەروادە، هەکو پشتی بیست سالان ژ دەربەدەری و بەرزەبوونێ ڤەگەڕایە مالێ، وی و کوڕێ خوە تۆلا خوە ژ هەمی تەماعکارێن عەرش و هەڤژینا وی یا ل هیڤیێ مای ڤەکر.

ئەو باگەڕێن د سەر پەنداریيا مە ڕا و

وەرمتنا چاڤان ژ کێم نفستنێ،

ل پاپۆرێ ددەت، پێ نەڤێت، باهۆز لێددەت و

مە دهاڤێژتە بنی بنی..

ئەو بنێ سارا

***

شخير أوديسيوس. من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩)؛ ص٥٣-٥٥.

---

[10] ئەفسانە دبێژیت: خوداڤەندێ بای تەلیسەک یان چانتایەکا کونترۆلکرنا بای دابوو ڤ ئودیسیۆسی، لێ دەریاڤانێن ڤەلس و چاڤبرسی هزرکرن کو ئودیسیۆسی زێڕێن خوە د وی تەلیسیدا ڤەشارتینە، ئەڤجا دەمێ ڤەکرین با ڕەڤی و پاپۆرا وان جارەکا دی بەرزە بووڤە.

## نەخێر.. نە ئەوم یێ تو هزر دکەی

نە سەربازم

هەمی دەمان یێ نەخۆشم!

نە فەرماندەم

ژ وێ چەندێ ترساترم!

نە هەلگرێ بەیداغیمە

دەستێن من دخافن، لاوازن!

نە هزرمەندم

هزرکرن من گێژ دکەت!

...

بێشک نە دانەرێ یاسایانم ل پشت پەردێ[11]،

---

[11] ئاماژەیەکە ژبۆ گۆتنەکا شاعرێ ئینگلیزێ مەزن شیللی هەکو دبێژیت: "شاعر یاسادانەرێن ڤێ دنیایێنە ل پشت پەردێ- ئانکو یاسادانەرێن نەخویاکری".

یاسادانەر پراکتیکینە، دلرەقن

هەردەم ب نەتاگیریێ خوە ددەن نیاسین

وەلێ ئەز یێ خلوولە و گەمژەمە

ئو هەردەم یێ لایەنگیرم!

...

ئەز نە چمە، ژ بلی سروودبێژەکێ گەرۆک

ل سەر گوندێن چۆل دگەڕم

ژێ بار دکەم و سترانێن خوە بۆ دهێلم

کو دێ ژیرکەن...

پشتی یەک رۆژێ دێ ژیرکەن!

***

لا.. لست من تظن. من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩): ص٥٧-٥٨.

## کورسیکەک ل ناڤ بەفرێ

ئەڤ کورسیکا ب تنێ و سەتماندی

د بن بەفرێڤە دڕەجفیت

دەمێ وی هات کو ل سەر پێژنا پێنگاڤان

ئو چرینگێنا پێکێن مەیێ و ریتما ئاوازێن تێلعوودان

ل نەورۆزێ بهێتە سۆتن...

...

ئەڤە ئەوە.. د نفستنێدا ژبەر دئاخڤیت

ڕازەکێ خویا دکەت خەلک هەمی دزانیت

سولتان تێ نەبیت؟!

*

کرسي فی الثلج؟ من دیوان (کف عني یا فیثاغورس- ٢٠١٩)؛ ص٣١.

# ژ ڤێ گەشبینیێ بێزار بووم

ژ ڤێ گەشبینیێ بێزار بووم

ئەڤە وەلاتەکە.. یێ نیڤ شێتە و نیڤەک خرشە!

ئەڤە وەلاتەکە.. دوجانییا وی کاملان نابیت،

چ ژێ نازێت، ژ بلی زارۆکێن سەقەت!

ئەڤە وەلاتەکە..

گەر ب گەنجەکێ بەهرەمەندار ئاڤز ببیت

دێ ژیەر بەت، دێ کەتە خوارنا حەفتیاران و

تەیرێن ئاسنی.

ژ ڤێ گەشبینیێ بێزار بووم

ئەڤە وەلاتەکە.. چ ژ نواندنیێ نزانیت

لێ هەر داکۆکیێ ل سەر دکەت

داکو ترانەپێکرنان ژێ بچنیت

ئەڤە وەلاتەکە.. تنێ ژبۆ دەمبۆراندنێ،

باب زارۆكێن خوە دقوتن و

كور لەعنەتان، ل دايبابێن خوە دبارينن

دا پشتڕاست بن كو هێژ ساخن!

...

ڕۆژ و هەيڤ دو پۆليسێن سەرمەدينە

ستێر ژى كەفەكە

ژ دەڤێ گۆتارخوينەكێ ئەبەدى دفڕيتن

ب حەيزەرانێ عەدەمێ،

دەست ژ وڕێنە و ئامارژەدانێ بەرنادەت..

...

ژ ڤێ گەشبينيێ بێزار بووم

ژ ڤى وەلاتێ، نەيێ من، بێزار بووم

وەلێ ژ بلى ڤى وەلاتى...

من چ وەلاتێن دى نينن!

***

سئمت هذا التفاؤل. من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩): ص٦٧-٦٨.

## سترانا زارۆکێ ئەبەدی

مرن.. برایێ من یێ مەزنە و

ل وی دەمێ ئەز ژ دایکبوویم،

ژ ماڵ دەرکەفتبوو

ژ هینگی وەرە هێژ نە زڤڕییە

...

گۆتبوونە من..

وی نامەیەکا بۆ من هێلای

داکو هەکو پیچەک مەزن ببم،

بخوینم

وەلێ پا ئەز مەزن نەبووم..

قەت چ جاران

مەزن نەبووم.

...

هنده‌ک جاران د خه‌ودا دبینم.

غار دده‌مه به‌ر هه‌مبێزا وی و

ڕوویێ خوه هه‌ر.. ب ڕوویێ ویێ زڤر و

ڕیهێن وی یێن گژ دخوڕینم

ئو دبێژمێ: تو بۆچی گیرۆ بووی؟

...

مشه جاران..

من ژ دایبابێن خوه داخوازا ره‌سمه‌ک وی دکر

لێ به‌رێ خوه وه‌ردگێڕن و

دبن لێڤلێڤکانڤه دبێژن: نینن..

چ ڕه‌سمێن وی ل ماڵ نینن.

...

گه‌له‌ک جاران من پرسیارا سیمایێ وی،

ته‌مه‌نێ وی و ژڤانێ هاتنا وی ژێ دکر

متییا گۆڕان ئه‌و ددایۆشین.

...

**جار ژی هەنە توورە دبم،**

**دەنگێ خوە لێ بلند دکەم**

**ئەرێ ما نە کورێ ومیە؟**

**ما وە نەڤێت بزڤریتەڤە؟**

**باڤێ من پووتێ دبیت و دایکا من..**

**من دکێشتە ب بەر سینگێ خوەڤە:**

**هشش بە.. هششبە بچووکۆ!**

...

**دبیت ژ ڤەگەرا وی بترسن**

دبیت پەشێمان بن کو هێلای..

وێ مەجازا بەرین ببڕیت و بگەهیتە،

وی دەرگەهێ کەڤنێ داری

دبیت ژی ئەو.. باوەر ژ خورافاتان بکەن

وەلێ پا ئەز..

دێ هەر د مەجازا مژداردا

باریبا کەم و سترانا بێم...

ل نێزیک عەبایێ دایکا خوە

ئەو عەبایێ هەلاویستی.

...

ل وی دەمێ دهێت، دێ ژ دەرقوتانا وی زانم

بێشک دێ ب بەرڤە کەمە غار

دێ ڕوویێ خوە د ڕوویێ وی دەم

دێ هێلم من بلند ڕاکەت

د هەوایێ سەیردا بلند کەت

ب تەڤاڤی وەکو وێ یا د خەونێدا!

***

أغنية الطفل الأبدي. من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩): ص٧٣-٧٦.

## بۆچی نانڤی؟

بۆچی نانڤی؟

پشیک، صه، ئەجنه، کۆلان، نانپێژی، کەرخانە، پیرهەڤی، هەلبەست، مامک، هێتیمخانە، گویفک، کارخانە، کۆلک و کوتر نڤستن!

بۆچی نانڤی؟

ته چ ل بەره

دەمژمێرەک ژ هشیاریێ؟

ما بۆ چییه ئەو هشیارییا

مرنا بلەز نەچێترینیت؟

بۆچی نانڤی؟

چاڤێن ته دهشکن؟

مەژیێ ته یێ ئازرێنەره؟

تو نزانی جێ پێنگاڤێن بهێت کیڤەیه؟

ئەڤ تارییە تە دترسینیت؟

ئەڤەیە یا تە لاواز دکەت

کوبارییەکە دەرمانێ وێ

ئێشەکا کەڤن و دێرینە

جالینۆسی[12]، نهێنییا ساخبوونا وێ نە زانی بوو:

تو کیڤە بچی، نێ پاشی دێمێ مرنێیە

ئەڤجا تەنا ببە،

بەهانەکێ ژبۆ ڤێ بەهانەیێ ببینە

ئو پێکێ ژبیرکرنا ووردەکاری یێن بچووک ڤەخۆ

ئەنیشکا خوە درێژکە سەر نیلۆڤەرا* بیرەهییان

خوە ل سەر وی نەرمە خیزی درێژکە،

ێ جەستەیێ خوینەلۆ ب دۆڕانان وەردگریتن

ژبۆ پێکەنۆکێ/ مامکێ/ دژینێ بکەنە و

---

[12] جالیلۆس (١٢٩- ٢١٦ ز): ئێکە ژ نۆژدارێن هەرە ناڤدارێن گریکی، ئێک بوو ژ ئەوێن نۆژداریا نوو دانایین کو گرنگیێ ب تێبینی یێن توێکارێ بدەن، هەروەسا باندۆرەکا مەزن ل سەر گەلەک تایبەتمەندی یێن نۆژداری یێن مینا زانستێ توێکارێ، کارئەندامزانیێ، نەساخیزانیێ و نۆژداریا دەزگەهێ دەماران هەبوو. مل ب ملێ ئەبیقرات ستوونەکا نۆژدارێیە ل هەموو جیهانێ.

* نیلۆڤەر: سووسنا ئاڤی.

دو دێرێن هەلبەستا ب کێش و سەروا

ل سەر تاوانا داوی بتی بڤەهوینە و

ئاهەنگەکێ ژیۆ شیڤا خوە یا هەپارەیی بگێڕە

سلاڤەکێ..

ل سەر کتێلیێا خوە بخوینە!

***

لم لا تنام. من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩): ص٨٣-٨٤.

# سترانەك ژبۆ یەهوەی

یەهوە[13]، کالێ شیرخۆر

یێ ماندی بوو، یان بێزار ببوو

د غای دچیت و تبلا وی یا د دەڤێ ویدا

وی بەرهەمێ چێکرییێ خوە،

یێ هێلایە د هەراییێدا، ناهێت بەرێک!

...

یەهوە هۆ یەهوە

ئەی کالێ شیرخۆر

خرابییەکا مشە ل سەر عەردی هەیە

---

[13] یەهوە: خوداڤەندەکێ رۆژهەلاتیێ کەڤنە، خوداڤەندێ نەتەوییێ هەردو میرگەهێن ئیسرائیل و یەهۆدا یا ئیسرائیلییانە. ل سەردەمێ کەڤن ئیسرائیلی و کەنعانییان گەلەک خوداڤەند هەبوون وەکو ئیل، عەشیرەت، بەعل... لێ ب نێزیکبوونا سەبیکرنا بابلیی هەموو خوداڤەند ماندلاکرن و دگۆتن کو تنێ یەهوە خودڤەندێ نافرینەرێ ئێکانەیە.

یەهوە هۆ یەهوە

مەیلداری و پێشێلکاری

تە بۆچی هۆسا لەز

ل ڕۆژا ڕاحەتا خوە کر؟

...

یەهوە هۆ یەهوە

ئەی یەهوەیێ مەزن

لەزێ ل شەمبیبوونێ نەکە

دبیت تە پێدڤی ب هندەک ڕۆژێن دی ببیت

دبیت مەهەکا ب هەمیڤە بیت

هەتاکو ل سەر.. چێکرییێ خوە یێ زال بی!

***

أغنية الى يهوه. من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩): ص٨٥-٨٦.

## يێ كورد بكوژن

گورگێن عەردی، تەڤدا یێن کێلبێن خوە دهوسین.

رەفێن قەلەرەشکان یێن ئاسمانی پڕ دکەن.

صە.. مەشقێ ب گەوری یێن خوە دکەن

مشکێن مالێ یێ بەرهەڤییا رەڤینێ دکەن.

"جاش" دولاران دهەژمێرن و شاشکدار ژی

خەلکی ژ "کورێن ئەجنەیان" ئاگەهدار دکەن.

ل چایخانان، کۆمونیستێن تۆبەدار "لینین"[14]ی

دهاڤێژنە ناڤ گلێشی[15]

لیرالی یێن نووخواز بەلووعەکێ دکۆلن

---

[14] لینین: ڤلادیمێر ئەلیێچ ئولیانۆڤ یێ ناڤدار ب لینین (١٨٧٠- ١٩٢٤)، هزرمەند و شۆرەشگێرەکێ رۆسییە. دامەزرێنەر و ئێکەمین سەرۆکێ رۆسیا- ١٩١٧ و ئێکەتییا سۆڤیەتێ ١٩٢٢- ١٩٢٤) بوو، هەرچەندە ئەو مارکسیی بوو لێ هزرێن وی ب لینینیزمێ دهێنە نیاسین.

[15] ئاماژەیە ب کتێبا "مافێ نەتەوەیان د بڕیاردانا چارەنڤیسێ خودا" یا ڤلادیمیر لینین.

کووریپا وێ چوارده پێ بن،

تەرمێ "سەرۆک ویلسۆن"ێ بەرددەنە تێدا[16]

یێن گەور[17] ژی، ب مشەیێ (بەلێ و بەس پا)یێ بکار دئینن

خوە ژبۆ دل لێهوینکرنێ بەرهەڤ دکەن.

عەگیدێن فێسبووکێ، دویڤچوونا فەرهەنگێن خەبەرا دکەن.

"فەیلی" چانتێن خوە یێن کەڤن دگۆگرینن

هندەک هەڤسوی، ژبەر پەنجەران دویڤچوونێ دکەن

یێن ماینە ل هیڤیا "فەرهۆد"[18]ێ

هەزار یێن ل سەر هەردو ڕەخان

گوستیرکێن شەهیانێ.. ژبۆ کوشتێ یێن خوە دکرن.

دەولەمەند ڤیزا یێن خوە نوو دکەن

سیاسەتڤان یێن حسابا زیانێ و قازانجێ دکەن

---

[16] ویلسۆن: تۆماس وودرو ویلسۆن (١٨٥٦- ١٩٢٤) سیاسەتمەدار و ئەکادیمیستەکێ ئەمێرکییە ژ پارتا دیموکراتان. سەرۆکێ (٢٨)ێ یێ ئەمێریکا (١٩١٣- ١٩٢١) بوو. ل ڤێرە ئاماژەیەکە بۆ وان هەر چوارده بنەمایێن ل سالا (١٩١٨)ێ، داینە خویاکرن.

[17] گەور: ئەو ڕەنگێ دناڤبەرا ڕەش و سپیدا (رمادی). مەرەم پێ ئەوێن دناڤبەرا هەردو جەمسەراندا.

[18] فەرهۆد: کریارا دزی و تالانکرنا وەلاتی و هەڤوەلاتییان د رەوشەکا ئاژاوەیی و بێ یاسادا، دبێژنێ فەرهۆد، فەرهۆدکرن.

زارۆکێن خوە...

دهنێرنه وان وەلاتێن کو ژ رێکا شاشیێ فەددەن

سەرکردە کۆم دبن،

داخویانییان ددەن و د دویفرا کۆم دبنەڤە

بازێر ل بەندا بۆمبەیانن

شیرەتکارێ سیاسی دکوخیت و پاشی دبێژیت:

"یا ژ منڤە دەم، هەروەکو بەری سەد سالان،

قەت و قەت نەگونجاییە."

رێکخراوێن (NGO)[19] تەڤدا دبێژن:

"هێشتا زوویە، خیڤەتگەهان بەرهەڤ بکەین."

ژ هەر چوار کوژییان

رۆژنامە و تەڤایا دەزگەهان

کەنال و سەکۆیێن ئازاد

بالیۆز و پەرلەمانتار و هەمی پەیڤدارێن فەرمی دکەنە قیژی:

---

[19] کورتکرییا تێرمێ رێکخراوێن نە حکومییە ( Non Governmental Organizations).

بۆ کورد بکوژن.. بۆ کورد بکوژن

بۆیاغچی یێن پێلاڤێن مە بکوژن

کوولەیێ مە یێ نەگوهدار بکوژن

بۆ کورد بکوژن..

ئەوێ هەردەم خەونا دبینیت

ل فڕینگەهەکێ دابەزیت و ببێژیت:

سلاڤ..

ئەز ژ کوردستانێمە!

***

أقتلوا الكردي. من ديوان (كف علي يا فيثاغورس- ٢٠١٩): ص٨٩-٩١.

# فیساگۆرس[20].. ژ من ڤەبە

سەبارا من، پێ هاتیم دا تەماشەکەم

نە دکرم و نە دفرۆشم

قەبخواستنێ دگەل چ قەبخوازان ناکەم

هەر ژ دەمێ زارۆکینیێ، هەما بەس ڤێ

ل هەر میهرەگانەکێ دکەم و تەماشە دکەم

وەلێ پا ئەز ژێ بێزار بووم

بێهنا من یا ژ کۆپیکرنێ و دوبارەبوونێ تەنگ دبیت[21].

دبیت ڤێ هزرا خوە بگوهورم

ئەگەر من تشتەکێ نوو دیت!

---

[20] فیساگۆرس: فیساگۆرسێ سامۆسییە (٥٧٠- ٤٩٥ ب. ز): فەیلەسۆفەکێ یۆنانا کەڤن بوو، گەلەک تیۆری یێن زانستی و بیرکاریێ ب ناڤێ وی (فیساگۆسیی) هاتینە و باندۆرەکا مەزن ل سەر پرانییا فەیلەسۆف و زانایێن یۆنانێ و جیهانێ هەبوویە.

[21] ئاماژەیە ژبۆ باوەرییا فیساگۆرسی ب پرۆسەیا کراسگوهۆڕینێ، وە باوەر دکر کو هەموو گیان نەمرن و هەر گیانەک پشتی مرنێ دچیتە دناڤ جەستەیەکێ نوودا.

لەوا ل ڤێرە ڕوونشتیمە و هەروەک گۆتین،

ئەڤ کورسیکە، ب ناڤێ من یا تەرخانکرییە

هەتاکو ئێک ژ مە فەنا دبیت

ئەز یان کورسیک

...

هەرچەوا بیت..

ما دێ کیڤە چم؟!

...

فیساگۆرس.. دێ بەلا خوە ژ من ڤەکە

تو چ هەدارێ نادەی من!

***

کف عني یا فیثاغورس. من دیوان (کف عني یا فیثاغورس- ٢٠١٩): ص٩٧-٩٨.

# بۆچی ژ بەهەشتێ دترسم!

بەهەشت ژ هەمی جهان بێزارترە

دژوارترە و مەترسیدارترە.

ئەڤە ئەوە کو ژ ستranان فێربوویمێ،

ئەوێن هەردەم دگۆتنە من:

"بەهەشتە بەهەشتە... ئەڤ وەلاتێ مە بەهەشتە"[22]

یان ژ کتێبێن خواندنگەها خوە فێربوویمێ

ئەوێن هەر ڕۆژ دگۆتنە من:

"هێی... کەرۆ، ژیر نەکە کو وەلاتێ تە

بەهەشتا خودێیە ل سەر عەردی!"

ژ لافیتەیێن سەر جاددەیا و

وێنەیێن وان سەرکردەیێن وەروەرێن وان،

---

[22] وەرگێرانا دەستپێکا سترانەکا عەرەبییە: (جنة جنة جنة... جنة یا وطنه)....

بێ ڕاوەستان دکەنە کەنی و فەرمانا ل من دکەن

کو سوپاسییا خودێ بکەم

چونکو وایرێن کارەبێ ژ بەهەشتێ

وان یێن گەهاندین گوندێن مە.

...

دبیت ستران درەوین بن

تەڤ کتێبێن خواندنگەهان مشت شاشی بن

لێ ب دروستی یێ ژێ دترسم

ژ ئەڤان بەهەشتێن سۆزدایێ و ل گەل مەگۆتین

یێ ژێ دترسم...

چونکو بیرا من ل ڤان وەلاتان دئینیت!

***

لماذا اخاف الجنة. من ديوان (كف عني يا فيثاغورس- ٢٠١٩): ص١٠٦-١٠٧.

# وەلات

من وەلاتەک هەیە

ئەڤە ڕاستییە...

ڕاستییەکا پشتڕاستکرییە وەکو مرنێ

وەلێ یا ئەز، ئها ئارێشە ل ڤێرەیە

ئەز نزانم دێ چ لێکەم

....

هندەک جاران وە هزر دکەم بۆ ئێکەمین

خازۆکێ دەرگەهی دقوتیت، پێشکێش بکەم،

یان بدانێمە د بانکەکێدا و ژێیر بکەم

هندەک جاران هزر دکەم کو تا ئەبەدێ

ب ئێمانەت، بدانێمە دەف دۆستەک بێزار

جارنا ژی ئەز وە هزر دکەم

کو بکەمە د تویرکەکیدا

بەرەکێ ب سەنگ پێڤەکەم و بهاڤێژمە د ڕووباریدا!

.....

لێ هەر جارا لێ دنێڕم

ئەو ب چاڤێن خوە یێن بچووکێن شووشەیی

هێڤ دکەتە من..

کوربیا خوە یا سپی سپی دهژینیت و

ئەز دەرگەهی بۆ ڤەدکەم دا،

خوە بهاڤێتە سەر تەختێ من

دێم و ڕوویێ من بئالیسیت

ئەز ژی تژی کەنی دبم و ژ خوە ددەمە پاش:

- ئەی شەیتانێ بچووک

ژ من دوور کەڤە!

***

٢٠١١/٨/٢٦

وطن. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص١٠- ١١.

# کوشتنا شاعرەکی

نەخێر

وەکو هەر جاری، نە خەونە..

ئەندێشەیە ژبۆ شریتا کوشتنەکا کەڤن

تێدا تەرمێ خوە دبینم

ل سەر شوستەی، بێ هاڤێتییە و

ب رۆژنامەیان نخافتییە

....

دوماهی تشتێ دبینم

دەڤێ لوولییەکا سارە

شەویلاگێن خوە ل بەر سەرێ من ڤەدکەت

ئەو سەرێ هەردەم ساویلکە و

پڕ ژ بێهنا پرتەقالێ و

شلۆختەبوویی ژ گولان

....

ئاه.. هەڤالێن من

ئەوێن هوون ب پێشییا من کەفتین

من کوترکێن هێتیم دیتن

یێن ژ سەرێن وە دەردکەڤن

ب بێدەنگی بلند دبن و

ب سەر پەییسکێن عەوران دکەڤن

....

ئاه.. هەڤالێن من

ئەڤجا رێکێ ژبۆ سپیکوترێن من ڤەکەن!

***

٢٠١٠/٣/١٥

مقتل شاعر. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص٣١- ٣٢.

# ئێڤاری باش ئەی هەڤالۆ

ئێڤاری باش.. ئەی هەڤالۆ

تو چەوایی؟

ئەڤە چ سودفەیەک سەیرە:

تنێ بەری کاژێرەکێ.. من نۆچەیەک..

ل سەر دیتنا تەرمێ تە دخواندا

ئو من دڤیا ژ بلی گرینێ، تشتەکی بکەم

....

بەلێ هەڤال..

هێشتا ناڤگینەکا کەڤنا تاقیکرنێن سەربۆراینە

ژبۆ ئەوی خوداڤەندێ ژ هەمیا شێتتر

.....

فریشتە؟ بەلێ.. جارنا دهێن

وەلێ هەردەم درەنگ دهێن

پشتی کو جەستە سار دبن

هەما بەس دێ هژمارەک نوو

ل سەر دەفتەرکا خوە تۆمارکەت

ئەو دەفتەرکا پێچایی،

ب کەرەستەیێ جانگێن هەرزان

....

ئەری ل وێرێ.. ل جهێ هوون لێ

وە گوهـ ل دەنگێ فەیرۆزێ دبیت؟

....

ببوورە هەڤالۆ.. ئەز دێ نەچار بم کو بچم

بەرەف کیڤە؟!

ڕاستە.. بەرەف کیڤە؟!

....

ئێڤاری باش ئەی هەڤالۆ!

***

٢٠١١/٥/٢٥

مساء الخير يا صديق. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص٣٣- ٣٤.

# ژبۆ پەسنداریا دون کیشۆت[23]

ل سەردەمەکێ

نە ل بیرا ڤ سەرێ من ڕێ بچووکە

خەلک ب ئەڤینیێ دین بوون

ئو چەند ڕووبار هەبوون

سینگێ عەردی شەق دکر و

ترانە ب شویرهان دکرن

سوار بۆ هەڤشی دنفستن

نان ڕێ کێم بوو

لێ ستێر هەردەم نێزیکتر و

---

[23] دون کیشۆت: دون کیخۆتی دی لا مانچا ناڤێ پەهلەوانێ رۆمانەکێیە، نڤیسەرێ ئیسپانی سێرڤانتس ب دو بەرگان ل سالێن ١٦٠٥ و ١٦١٥ چاپکرییە. دون کیشۆت ب کتێبێن ڤێرسێ داخبار دبیت و ب خەیالا خوە دچیتە دناڤ سەردەمێ واندا و مینا وان رەفتارێ دکەت بێی چ ساخلەتێن ڕاستەقینەیێن وان هەبن. ئانکو هەمی کریار و گۆتنێن وی خەیال و وەهمن. ئەڤ هەڵبەستە ل سەر زارێ سانشۆ، خزمەتکارێ دون کیخۆتێ جوامێر و ساویلکە هاتییە نڤیسین.

ب ڕەونەقتر بوون

....

وەلێ پا عەرد

هۆ هەڤالێ مشت سەلخین

نە ئەو هۆتێلا بژوینە

ب کێر حەویانا فریشتان بێت

ژ بەر ڤێ چەندێ.. سەرەڕای ئەڤینی و

دلپێڤەمانا من هەیی و

وێ شێتییا ل گەل تە هەڤپشک

یێ نەچارم

کو هەڤسارێ کەرێ خوە یێ ب ئەختوبار

بەرەف گوندێ خوە بادەم و

تە ل ڤێرە بهێلم..

ل ڤێ چۆلاهییا ب ترس و ب خەریبی

دا ب تنێ.. هەڤرکییا ئاشێن بای بکەی..

....

قوربان.. حەز ژ تە دکەم

ببوورە کو من تو هێلای

من چ نینە بدەمە تە

ب تنێ ئەڤ نانێ ڕەش و..

پەنیرێ کەڤن و گۆزکێ مەیێ بۆ تە بهێلم.

....

قوربان.. خوە ژیر نەکە

خوە ژیر نەکە

ئەگەر تە کر.. دێ خەمگین بم

دێ گەلەک.. خەمگین بم!

***

٢٠١١/٩/٥

في الثناء على دون كيشوت. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص٤١-٤٣.

# سوحبەتێن گیرۆبوویی یێن سولەیمانی[24]

## سوحبەتا بەقێ

پیچەکێ یێ مەستم

ژ گەزینا شەویلاگێن خوە دزانم

ژ پرپێژیەکێ: وان پەیڤێن ل سەر زمانێ من

کێبەرکێیانێ دکەن و ب ئێکودوڤە دهەلنگڤن

"ئاه... ببوورە خویشکێ!"

ئو دبۆریت.

........

[24] سولەیمان: ل گورەی قورئانا پیروز ئێکە ژ پێغەمبەران کو ناڤێ وی د کۆمەکا سۆرەتاندا هاتییە وەک: سبأ، النمل، البقرة، الانعام، الانبیاء... وی زمانێ باڵندەیان و ئاژەڵان دزانی، دشیا بای کونترۆلکەت و ئەجنە و عفریت ژی هەبوون ژبۆ خزمەتا وی. لێ ل گورەی تەوراتێ (تەلمۆدێ و پەرتووکا مەلیکێن ئێکێ): شلومۆیێ کورێ داودییە و ئێکە ژ چل و هەشت پێغەمبەرێن وان، سێیەمین مەلیکێ ئیسرائیلا ئێکگرتی بوو بەری دابەش ببیت.

ئەز ب تەنا خوە، ڕێ سەرخۆشم

همهمەکا ژ وێ پەنجەرکا،

من یا ل سەر شەڤا هاڤینی ڤەکری

نێزیک دبیت و دوور دکەڤیت..

دهێت و دچیت.. وەلێ پا بۆ من نەخەمە

ما دێ بۆچی.. بۆ من خەم بیت؟

........

بەقەک د شەقا دەرگەهی ڕا هاتە د ژوورڤە

ڕادبمەڤە کو دەستڤەدەم..

- "ئیشەڤ تو مێڤانێ منی!"

چاڤێن وی یێن ب گری دگۆتن:

- هەڤال!.. تو ڕێ مەستی، ژ من ڤەبە..

دا دەرکەڤمە سەر وی گیایێ ڤەشووشتی

ێ ئەز ژی.. ئاخخخ.. یا مەست و خەمگینم

.......

- کا بێژە من.. ئەی بەقا من یا چاڤبلۆق

- ئەرێ ما تو.. ژ دەنگێ گوللەیان دترسی؟

- کاک!

- ما عاشقێ پتر ژ ئێکێیی؟

- کاک!

- ما سیکارەک.. بفرەک.. بومبەیەک ل گەل تە هەیە؟

تە باوەری ب خودێ هەیە؟

- کاک.. کراک.. کاک!

**

٢٠٠٦/٥/٢٨

## سوحبەتا قەلەڕەشکێ

"سوبەهی دێ جەنگ دەستپێکەت"

قەلەڕەشکێ کرە قیژی و

دادا سەر دارقەسپەک بوغومی

من دەستێ خوە دانا سەر دلی و هەناسە دا

پاشی من گۆت: خودێوو.. ما بۆ جارا دەهێ؟!

**

٢٠٠٣/٣/١٨

## سوحبەتا كوتران

ئەی كوتركا حێنج و ڕكۆیی

سوپاس بۆ تە

چونكو.. تە فڕینا

ل بەر بارانێ هەلبژارت

چونكو تو: كوكو.. كو

تە تڕانە ب هەمی چەل و چەپەران كر

تە: كوكو.. كو.. دچێتراند

**

٢٠٠٦/٨/١٥

## سوحبەتا مێریێ

خزمەتکارا ڕەش ژبۆ هەڤاڵا خوە چرپاند

قەت نەترسە.. ئەڤە سولەیمانێ کاڵە

پاشی ب تیقەلیقێ گۆت:

"چۆگان ژێ ستاندن و

ئێدی نەما سۆپایەک هەی!..."

*

٢٠٠٦/١٠/١٥

## سوحبەتا سیمەرخێ

کا بۆ من بێژە خویشکا من

کا کەنگی تە سوهتن ل بەرە

دا هەستیکێن خوە بێن تەنا

ب گرێ تە یێ پیرۆز گەرمکەم

ئەز دزانم تو یا لالی، مینا هەمی جانێن پیرۆز

تو بێزاری.. مینا هەمی جانێن نەمر

لێ تو.. - خۆزی ئەز تو بام-

تو دشێی شاشیێ بکەی و

سەربۆرا خوە دوبارەکەی

جار ل دویف جارێ و

جار ل دویف جارێ.

***

٢٠٠٦/١٠/٢٠

سليمانيات متاخرة. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص٥١- ٥٧.

## پاییز

**- "ئەز ژی هەست ب کەسەرەک کوور..**

**ژ تەڤ تشتان دکەم..."**

ئەو زەلامێ پیر زۆرزانە

د وەغەرێن خوەیێن کورتدا

ل ناڤبەرا چایخانێ و مال

بیردانکەکا وێرانبوونێ دگەلدایە

**- "ئەز ژی هەست ب کەسەرێ دکەم**

**ژ بازێری.. ژبەر وی**

**ژ رۆژا کزبووی**

**ژ خوداڤەندێ تۆزێ هەکو تانج ل سەر سەری**

**ژ وی ئاگرێ ئێدی چ تشتان گەرم نەکەت.."**

زەلامێ پیر، ژ بلی کوخکێ چ ئاوازان ناچرپینیت

**- "ئەز ژی هەست ب کەسەرێ دکەم..**

**ژبەر مالا من یا کەڤن و**

**مشکێن وێ.. پەنجەرەیێن وێ یێن داری و**

**تەڤایا کۆڤارێن کەڤن و**

**رەسمێ جیمس دین[25]، ئەوێ ب شینی چاپکری"**

**ئەو زەلامێ پیر ڕادوەستێت**

**پەنتەرۆنێ خوە هلددەت و**

**بەرچاڤکێن خوە و وان ڕۆندکێن پێ گریانێ**

**د بنڤە ڤەدمالیت**

**ل ڕۆژێ دنێریت..**

**ئەو ڕۆژا پویتە ب چو نەکەت..**

**- "سەیرە.. ئەڤ ترێنە چەند لەزگینە؟!"**

*******

٢٠٢٠/١٠/٢٤

خریف. من دیوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص٦٣- ٦٤.

---

[25] **جیمس دین: ئەکتەرەکێ ئەمێریکیێ ناڤدارە ل سالا ١٩٣١ێ ژ دایکبوویە و ل ٣٠ێ ئیلۆنا ١٩٥٥ێ ب بۆیەرەکێ ترافیکێ گیانێ خوە ژ دەستدایە. ئێکەمین ئەکتەرێ هولیوودییە کو پشتی مرنا خوە دوجاران ژبۆ خەلاتێ ئۆسکار بەربژار دبیت. ئەکتەرەکێ خۆشتڤی بوو ل دەف بینەران.**

# سترانا ڤالانتاینا بچووک

ڕۆژەکێ..

دێ چاڤێن خوە نقینم و

د گوهێ تەدا، دێ چرپینم:

"ئەی خۆشتڤی، نەکە گری

چ تشتەکێ ب ترس نینە..

پاپۆرا من ل بەندا منە..

"سوپاس بۆ ڤێ وەغەرا جوان"

.....

دبیت تو بەری من بچی.. ئەی خۆشتڤی

ب دەستێن خوە..

چاڤێن تەیێن ئەسیری بدانێمە سەرێک

هینگی.. دێ دەستێن تە ماچیکەم و

**چ نابێژم، ژ بلی هندێ:**

**"سوپاس بۆ ڤێ وەغەرا جوان"**

**....**

**هەرچەندە وان باوەر کر و**

**چاڤێن مە "ل وێرێ" ڤێککەفتن**

**دێ ژ هەر تشتی بارکەم و**

**تەڤ خۆشییان و کورسییان و گۆزکان**

**بۆ وان هێلم**

**دێ بەر ب سەمتا تەڤە غاردەم**

**هەردو چاڤێن تە ماچکەم و**

چ نابێژم ژ بلی هندێ:

"سوپاس بۆ ڤێ وەغەرا جوان"

***

٢٠١٠/٢/١٤

أغنية فالنتاين الصغيرة. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص٩٣- ٩٤.

## لاڤایەك.. یان بەهەشتا كوردان

خودێوو.. گەر بڕیارە مە ببەی بەهەشتێ

دگەل مەدا.. پێ نەرمین بە

ژ وێ نەرمییا تە سۆز پێ دای:

مە ژ چیلكان بێبار نەكە..

داكو ل نەورۆزێ بسۆژین!

هەمی مەیێ و هنگڤینی ببە

تنێ چیلكان بۆ مە بهێلە

ل بەهەشتەكێ.. دترسم كو ئاگر نەبیت

كورد ل دۆرێ سەمایێ بكەن!

.....

خودێوو

ئەگەر "ل وێرێ" من ماف هەبیت

هەر چییا من بڤێت داخوازكەم

ئەڤە ئەزم.. تکایێ دکەم،

من کۆپییەک ژ بەهەشتێ دڤێت

ب تەمامی وەک عەردی بیت:

دلبەرا من و

زارۆکێن من و

حزمێن من و هەڤالێن من

ئێک ب ئێک و ئێک ئێکە..

حۆ ئەوێن من زوو ژ دەستداین ژی د ناڤدا بن..

یا من نەڤیت، تنێ ئەوە کو جارەک دی

دێمێ بکوژەکی

یان سولتانەکی

یان بازرگانەکێ چەکی

"ل وێرێ" ببینم!

.....

خودێوو.. ئەگەر بڕیارا تە ئەو بیت

هەمی "ل وێرێ" ب ئێک زمانی باخڤن

ئافرەتەیەک بچووک بدە من:

دەستویرێ بدە..

ب حەفت زمانان ستران ببێم..

رجایێ دکەم

تو زمانێ دایکا من قەت نەگوهوڕی...

کی دێ من نڤینیت..

کی دێ گریا من ڕاستینیت

کی دێ ترسا من ژ شەڤێ.. ڤەڕەڤینیت

گەر دایکا من، سترانێ بۆ من نەبێژیت:

لایێ لایێ.. لایێ لایێ

کوڕێ منۆ بنڤە بنڤە

تە خەو خێر بیت جەرگێ دایێ.

***

۲۰۱۳/۳/۲۳

دعاء.. أو جنة الكردي. من ديوان (غلطة من هذه- ۲۰۱۵): ص۱۳۸- ۱٤۱.

# ژبەر ڤێنیە حەز ژ شەڕان ناکەم

ئەڤە دەمێ سیهـ سالانە

ئەز و هەڤژینا خوە

هەر شەڤ دەهـ جاران هشیار دبین

زارۆکێن خوە.. یان نەڤیێن خوە

دنخێڤین

ژبەر ڤێیە حەز ژ شەڕان ناکەم..

.....

من ل خوە دا کو بێهنا شیری و

نانێ گەرم

ب بێهنا بارووتێ بشوبهینم

لێ.. من شەرمکر و خوە ژێ دا پاش

ژبەر ڤێیە حەز ژ شەڕان ناکەم..

.....

هەکو کتێبەک نوو دکڕم

ئەز چاڤێن خوە دنقینم و

ڤەدکەم.. ددانێمە سەر دێمێ خوە

بێهن دکەمێ و هەر بێن دکەمێ

گەزینەکا خۆش من دگریت

ژبەر ڤێیە حەز ژ شەڕان ناکەم..

.....

ل سەرێ جاددێ

خوارنگەهەک بچووک لێیە

ئێڤارییان گەنج لێ خڕ دبن

بۆ من خۆشە..

ل وی کارکەرێ پیشە کارامە بنێڕم

هەکو گرکان

دهاڤێژتە دناڤ زەیتا کەلدا..

ژبەر ڤێیە حەز ژ شەڕان ناکەم..

......

ئەڤە هاڤین یا نێزیک دبیت

پێدڤییە مارپیچەکێ نوویێ ئاڤێ بکرم

دا هەر هەفتیێ دوجاران

ئەز بەخچەیێ خوە پێ ئاڤدمم

ژبەر ڤێیە حەز ژ شەڕان ناکەم..

....

نەڤییا من جوانە

من دڤێت هەر..

ب کراسێ بویکینیێ ببینم

ژبەر ڤێیە..

ژبەر ڤێیە حەز ژ شەڕان ناکەم..

***

٢٠١٥

ولهذا أكره الحروب. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص١٥٢- ١٥٥.

## سێلفییەك دگەل تەرمێن دژمنێن خوە

دەستێ من پێ.. د تەقن و خوینێ وەربووی

من نەڤێت مۆبایلا خوە پیس بکەم

جهێ داخێیە- کو نەشێم

سێلفییەک باش

ل گەل تەرمێن ڕزی بگرم

....

هەڤالۆ.. کا دەستێ خوە درێژ بکە

مۆبایلێ ژ بەریکا من بینە دەرێ و

وێنەیەکی بۆ من بگرە

دا ل سەر فێسبووکێ بەلاڤکەم

کو وەک دیرۆک..

وەک بیرییا ڕۆژێن فەرازیێ بمینیت

.....

دیٚ خزمێن من

یارا من و هەڤالێن من پێ دلخۆش بن

وەلیٚ بێشک

دیٚ دژمنێن خودیٚ و نەیارێن وەلاتی

کەرب ژێڤە بن

......

بەس بابرکەکیٚ خوە بگرە

هەتاکو جگارەکیٚ دداگیرسێنم و

سەریٚ خوە ب هزر و تێرامانی،

بەر ب ڕەهەندێڤە باددەم

ئەو بێگومان

دیٚ وێنەکیٚ رۆمانسی بیت

هەژی هۆزانڤانەک وەک من

.....

هەولدە هەمیٚ دەربێخی:

زکیٚ دڕاندی

پرچا سەرێ بوویە رەژی و

وان پیقێن رویسێن وەرمتی و

مێشان.. چاڤێ کامیرێ نێزیککە

من دڤێت مێش ژی دەرکەڤن

هەروەکو وان فلمێن کەڤنێن بابا سەددام[26]

ل ناڤبەرا قۆرئانێ و فلمێن کارتۆنیی

پەخش دکرن.

......

سەحکەیێ کا ڤی وێنێ من

چەند "لایک" چنین؟!

***

٢٠١٥

سيلفي مع جثث أعدائي. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص١٥٦- ١٥٩.

---

[26] ل سەردەمێ رژێما سەددام حوسەینی، میناکێن شەرێ عیراقێ و ئیرانێ ب مشەیی پیشان ل سەر تەلەڤزیۆنێ ددان. ب قۆرئانێ و پاشی ب ڤلمکارتۆنی دەست پێ دکر، پاشی لێ نۆچەیێن شەری بوون. ئانکو مەرەم پێ ئەوە کو هەمی تەلەڤزیۆنێ ڤەدگرتن.

# جەنگ

بەرەکێ ل سەر دلێ من

وەریسەکێ ب ستوویێ منڤە و

ئاسمانکێ خۆلیکیێ نێزیک دبیت

....

ل سەر عەردی تەقنە

ل ئاسمانی فڕۆکەکە، فڕۆکەنە و

قەیدەکا وەک.. کڤانەکێ مەزن

هەر یا شۆر دبیت

***

٢٠٠٢

حرب. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص٧٧.

## بارانەك.. ل هنداڤ شنگال!

ل وان مالێن خودێ دەستویردای بپەقینن

چەند زەلامن، چ بازرگانی و فرۆشتن

دەستێ وان ژ کوشتنێ ڤەناکەت

وان تەعدایی ب دۆرانێ ل (سەبایا) کر

پاشی ل ناڤ باخچەی ڤەکوشتن

دەسترویڤەدان.. نڤێژکرن

دەرێ تەزینۆکان ڤەکر.. خوار و ڤەخوار

برک ڤەددان و وان سوپاسییا خودێ کرن

ژ نیعمەت و سەرکەفتنا وی

ئو د غایچوون.. چونکو شەیتان خلماش[27] نابن!

......

---

[27] خلماش: د غایچوون، قیلولة، إغفاءة. ئاماژەیە بۆ فەرموودەیەکا پێغەمبەری (س)، دبێژیت: (أقیلوا.. فإن الشیاطین لا تقیل).

ل ناڤ باخچەی.. سەران چاڤێن خوە ڤەکرن

ل ئاسمانێ بلند دنێڕین

- "هێڤکەنێ (ئەوا کەزی ڕەش گۆت)

ل وێراهە.. ل بلنداهیێ

کەسەک پێ دکەتە گری.."

- "تو یا شاشی (ئەوا کەزی زەر گۆت)

چ جا ئاسمان ناگرییێتن

ئەو بارانا پاییزێیە.."

- "وەلێ ئەم هێژ پێ ل بوهارێ!" (ئەوا ژ هەمیا بچووکتر گۆت)

- "ئەرێ بۆچی هوون هش نابن (دایکا وان گۆت)

بۆ نانڤن؟ ما هوون نە دماندینە؟

دەڤ ژ پرێژێ بەردەن

چ بوهار ل ڤ واری نینن!"

***

٢٠١٥

مطر.. فوق سنجار. من ديوان (غلطة من هذه- ٢٠١٥): ص١٦٠- ١٦٢.

## سەر

ڕادیۆیەکا باوشکان ددەت

بەرچاڤکێن وەستیایی

تەستەک ژێ وی سەرێ گرێلکری

رۆناهییەک ل پشت

وەریس، شوور

هندەک قەلەم، دەمژمێرێن مەهی

پەمبی

کاغەزێن مۆرکری

سترانەکا نەتەمامبووی ...

ما ئەڤە سەرە؟

یاریگەهەک مشت ژ خەلکێ کۆلانکییە؟

یان سووکا زەرزەواتییە؟

*

کا جا نهۆ..

ئەنیا خوە ل ڤان هەر شەش دیواران بدە

ب متی دەنگێ خوە بلندکە

بەردەوام بە...

تە چ دەم نینە ب نفستنێڤە بەرزەکەی

لەزێ بکە

ئەڤە دەمێ لەزاتییێیە

ئەڤە دەمێ غاردانێیە، ل دویف وێ برووسیا ڕزی

وەک سترانێن.. عێلنجییا دئیننە پۆلیسەکێ سڤیل

هەکو دەستددەت جێرییەکێ و

ڤە حەفت سالێ

ژبەر ئێشانا بەربوویە جێ بن نافکا وێ

دکەتە گری

ئو سەرەڕای وان عەتارێن

دادای تەکیایێن گوندێ مە

ئەوێن ب تەقوایێ و خێرێ دارێشتی

خوە پێڤەنا و

ڤەشارتنا سەری ژ پۆلیسی/ فریشتەی

ئەوێ ل دورپیانێ ڕاوەستای

هەکو دەست دکەتە جێرپیەکێ

ب شەڤ و ڕۆژان دکەتە گری

ئەو سترانەکێ دهەلاڤێت.

*

یا ڕاست و ڕاست، دێ بۆ وە بێم:

ئەڤە یاریگەها تەپانێیە.. سووکەکا زەرزەواتییە

نەخۆشخانا وان مرییانە،

یێن پەرسیڤگرتی ژ ڕویسیێ

ل بەر باران و سەرمایێ

ماینە ل بەندا ڕۆژا حەشری و قیامەتێ

ئەڤجا ڤەخۆ و بلەزینە

بەلکو دبیت فەنا بی

یان ژیر بی

یان تم ژێ حێبەتی بیی

یان تشتەکی ژ وی بزانی

پێ تو کرییە د ڤێ جۆبێڤە

یان پێنەکێ.. ل ڤێ ڕادیۆیێ بدەی و

سەرێ خوە پێ هافێتی د تەستا زێڕیندا بڤەگەڕینی

ل هەمبەری والی/ فریشتەی/ پۆلیسی..

ئەوێ ل دورپیانێ ڕوونشتی

ترانا ب تە دکەت و

ب جێرییەکێ دکەتە گری..

تێ ناگەهی!

ئاه!

هەولدە کو تێنەگەهی

تەڤ ژیرییا خوە خرکە کو تێنەگەهی

دبیت چەند سالێن دی بژی

تا زارۆکێن تە دگەهنە تەمەنێ بێزارییێ و

ب سەر باشی یێن بێدەنگییا زێڕین هەلدبن

ئو ئەزمانێ تە بهاڤێنە بەر جوردان

دا سەمیانێ تە يێ قەدەر/ پۆليس/ فريشتە/ والى

ئەوێ ل سەر نڤينا تە نفستى

توورە نەبيت

سترانەکێ ژبەرخەو دبێژيت

ل سەر جێرييەکا خوە ڕويس دکەت

ل سەر وان سەرێن گرێل دبن

بەرى وەرزێ دوريێ و.. بازارا زەرزەواتێ!

***

٢٠٠٢

الرأس. من ديوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٩-١٣.

## زولەیخا

چاڤێن من ل دەردۆران دزڤڕین..

من سپیگولا د غایچووی،

ل سەر سینگێ یاری دیت

من ل ناڤبەرا نڤستن و هشیارییێ دیت

داخواز دکەت: "یارێ منۆ من هەمبێز بکە

من ببە دەف خوە

ئەڤێ هەمی شەنگییێ ببە

ڤێ گولاڤێ و ڤێ سوهتنێ

پاشی وەرە داکو نەمرییێ بدەمە تە

دێ وەرە دا فەنابوونا ل ناڤبەرا،

پەراسوی و بازنان.. بدەمە تە"

.....

ئو پێ یێن من خاڤبوون و

هەردو دەستێن من رەجفین

دناڤ رۆناهییا سەیردا

پستپستەک من بهیست یا گازی من دکەت:

"وەرە و

ڕووبارەکێ ژ (مەی) یا زەلال

بدە دەمارێن من یێن هشک"

....

لێ ئەز ژ فەنابوونێ ترسیام

ژ خەونا نەمرێ جنقیم

من رەڤین ژێ هەلبژارت و

گوملەکێن خوە ل پشت دەرگەهێ بجهـ هێلان!

***

٢٠٠٢

زليخة. من ديوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩)؛ ص١٧-١٨.

## چەند شیرەتەك بۆ هاملێت!

ما چییە گەر ببیە باپیر

یان بەری بگەهییە بیست سالیێ

لۆرییەکا گێل تە بکەت هەڤیر؟

ما چییە گەر تو دزەک بای

یان ژێ شەهیدەک ژیرکری

ما چییە گەر تە کربا غار،

هەر کربا غار و کربا غار

یان تە شۆستە کربا بنقوینک؟

....

باوەر ژ هەمی تشتان نەکە

دو رکاعەت یان پێکەک جنێ

تێرا تە هەنە داکو ب ئارامی بنڤی و

هەمی تشتەک وەکهەف لێ بێن.

....

گوهنەدە شاشێن برینان

یان قنینێن ئوکسجینی

گوهنەدە ماددێن تافیلکەر

یان ژی ئەوا ل ناڤبەرا هەردو ئاستان[28]

....

بەری هاتنا دەمی تو خوە.. نەڤەکێشە

هەوڵدەکو هەتا داوی لەرزینا خاڤ

گوهداریێا سترانێ بکەی

گەش دبیت وکز دبیت

گەش دبیت وکز دبیت

گەش دبیت وکز...

***

٢٠٠٣

نصائح الی هاملت!. من دیوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٣٣-٣٤.

---

[28] ئاماژەیە بۆ تێرمێ ئاستێ ل ناڤبەرا هەردو ئاستان د تێگەهێن (المعتزلة)دا، ژێو حوکمدانا ل سەر فاسقی دبێژن کو نە وەکو باوەردار دهێتە هژمارتن، نە ژی وەکو کافر، بەلکو ئاستەکە دناڤبەرا ڤان هەردو ئاستاندا.

# ئەی وێنەگر.. وێنەگرێ پیرێ مەیخانێ

ئەی وێنەگر..

وێنەگرێ پیرێ مەیخانێ

ڤێ کێلیکا تەنگەزار تو.. بۆ مە تێکە

دارێژە سەر بەرپەرەکی ژ بەرپەرێن ئەبەدیێ

ئەی وێنەگر

ئەم کۆمەکا سەرخۆش و سنێلاینە

د ڤێ مەیخانا هەژارڤە

بەس چوار کەسێن دلسۆزین ئەم.. شەشین؟

دبیت ژی ئەم حەفت بین

ما چ دزانین:

ئەم مەستین و ساویلکەینە

ئەی وێنەگر..

وێنەگرێ جوامێرێ مەیخانێ

بلا دلێ تە ب مەڤە بیت..

ب وێنەیێن مەڤە بیت

سوبەهی دێ..

مە بەرەف جەنگێفە هاژۆن

ئەی وێنەگر

وێنەگرێ مەیخانا مشت خەم و خەمگین.

***

٢٠٠٥

أيها المصور.. يا مصور الحانة العجوز. من ديوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٣٩-٤٠.

## گزیرتە یا ژێبیرکرنێ

گزیرتەیا ژبیرکرنێ و

زەمان..

سترانەکە یا بێ دوچاڤە

ل ڕەهەندا شین و.. ونبوونێ

دزڤڕیت.. دچیت..

.....

کۆمەکا شەهنگێن[29] مت،

چارۆکێن ژبیرکرنێ پێچاپی دلڤینیت

ئەڤجا دچەمیێن

ل ناڤ خیزێ داردەستی حێبەتیێ بووی

دحەلیێن...

---

[29] شەهنگ: نەورەس، پێلیستانک.

بوغومین من دادگریت و

دلەکدلەکیبا پێلان، یاریا ب من دکەت

من ژ زەراتیبا گێژبوونێ... پڕ دکەت.

....

ژ بلی ئاڤێ چ تشتەک ل ئاسۆیێ نینە و

عەورەکێ ساویلکەیێ ڕێ لێ بەرزە

هەکو ئارامیێ گومان ل دەف ئازراندی و

مایتێکرنێ ئەو هاژۆتی

خوە گیرۆکر، دا دیمەن بهێتە بەرچاڤا

هەتاکو کاروان ژێ بۆری[30]...

....

ژ بلی ئاڤێ چ تشتەک ل ئاسۆیێ نینە

ئەڤ پرسیارە دوبارە دکەت:

تو کیی؟..

هۆ.. پەریا دەریایان ل کیڤەیی؟

---

[30] مەرەم پێ کاروانێ عەورانە (موكب الغيوم).

ئەی نازکا تەڤ ئاسۆیان

خوداڤەندا پێلێن بەرز و بنێ دەریا...

ل کیڤەیە.. پەرِاڤێ رزگاربوونێ ل کیڤەیە؟

هەیهۆ خووشکێ، ئەرێ ما رێکەک بۆ هەیە؟

یان ژێ ئەڤە وەغەرەکە...

هەتا دەمێ فەنابوونێ

وەغەر دهاژۆت و ل دویف دچیت؟

***

جزيرة النسيان. من ديوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٤٥-٤٧.

# ئەوێن ڕزگاربووی ب سودفە

ئەم ئەوێن هند سەربەردای بووین

تا وی ڕاددێ بچینە کاری و

پیاسەیێن بازارا بکەین

ئەم ئەوێن سەرکەشی مە دهاژۆت داکو،

هەتا دەمێ هەنگۆرێ و پشتی مەغرەب

ژ مالێن خوە گیرۆ ببین

ئەم ئەوێن شێت.. ئەوێن ئەحمەق

ئەوێن ب خەونێن سڤک تۆشبووی

ئەوێن هێژ کتێبێن شعران دخوینن

کتێبێن شعرێن خرش و نەنخافتی و مشتی مامک..

دزانین هێژ نەمرینە

چونکو کێربڕان ئەم نەدیتین

ب قنارێڤه شۆر نەبووینه

چونکو راپۆرت ژ مه بۆرین

چ جاران برسی نەبووینه

چونکو مه بەرمایکێن نانی د هندەک سەلکاندا دیتبوو

.....

نه ژبەر هندێ کو وێرەکبووین

یان دایلان و سنووربڕ بووین

لێ قسمەت و بەختێن سەیر بوون

ئەو ئەم بووین

ئەوێن ڕزگاربوویی... ب سودفه!

***

٢٠٠٦

ناجون بالمصادفة. من ديوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٥٥-٥٦.

## د خلوەتگەها خوەڤە

### "هەلبەستێن هایکۆ"

(١)

هزار هەلبەست

ژبۆ ژنەکێ.

هزار ژن... ژ پێخەمەت هەلبەستەکێ!

(٢)

شیناتی ب ئوکسیدێن سەیر شێلی دبیت

گول یا دخەندقیت

شاعرۆ... ئەگەر بشێی بنڤە!

(٣)

جلکێن خوە دئێخم و هەلبەست دبارن

بێ ڕۆژێن خوە دکەمە بەرخوە و

بەر ب ڕۆژا گێلڤە دمەشم.

(٤)

ب دویف دەزیەکێ خوینێ دکەڤم

هەکو خوین ڕادوەستێت

دەمارەکا خوە دبڕم.. داکو هەر پێ بەردەوام بم!

(٥)

نیف دەمژمێر ژ خۆشیەکێ

دو خۆلەک.. ژ هیڤییەکێ

ڕۆژەکا درێژ درێژ.. ژ کۆژان و دەردەسەرییێ!

(٦)

پێ ل گولێ دانە- دەملدەست نامریت

دەمژمێرەکێ دلڤلڤیت، پاشی دکەڤیت

هەروەک بریندارێ جەنگێ.

(٧)

هەی فهێتی.. فهێتیا من!

سەرسۆرمانێ تو پێ گرتی

چونکو تو هێشتا پێ ساخی!

(٨)

من ڕیهێن بابۆی دتراشین، ئەو دگریا

بابێ من هەر پێ بێدەنگ بوو

پەنجەشێرێ گەوریێا وی دزی بوو.

(٩)

ب سەرخۆشی..

ڕازاینە سەر وی گیایێ خۆناڤگرتی

مە نەدزانی کا ڕۆژ دێ بۆ مە چ ئینن!

(١٠)

بێهنا هەسپی ل بەر سەرمایێ تەنگ دبیت

هەلم ژ خمخمکێن وی دفڕیت

ژ تنێیاتیێ... دکەمە گری.

(١١)

یەللا...!

(قامچییەکا ل سەر پشتا من)

یەللا... وەلات پێ گازی تە دکەت!

(١٢)

ل ته دنێرم، دلێ من درەجفیت

مرن دزەکێ شارەزایه

ئەرێ ما ته ژ من نا دزیت؟

***

٢٠٠٦

في عزلتي (قصائد هايكو). من ديوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٦٣-٦٦.

# ئو ل داویێ!

سوباهی بۆ من نەخەمە/ هێژ نەهاتییە

دوهی بۆ من نەگرنگە/ یا چوویی ییێ زڤڕین

ژ بلی نهۆ چ نەمایە/ ئەڤە ژی تشتەک هێسانە:

LAISSEZ-PASSER..... LAISSEZ FAIRE*

*

عەرد بۆ من نەخەمە/ تژی تەقنە

ئاسمان بۆ من نەگرنگە/ گەلەک یێ دوور و مژدارە

ژ بلی من چ نەمایە/ ئەو ڕێکارەک شیاندەیە

هندەک ژ نانی و.. ژ مەیێ.. ئو پیچۆکەک ژ ژیریێ!

*

---

* بهێلە کار بکەت... بهێلە ببۆریت

چ تشتەک بۆ من نەخەمە/ وە دانە دبیت من یا کری:

ئو ل داویێ... دێ دگەل نفستیان نڤم!

***

٢٠٠٦

وأخيرا. من ديوان (ناچون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٧١.

# سترانەك ل بەر بارانێ

چەلۆژەنێ ب ڕیھ

بەری دەمێ خوە مر

بومبە ژی، شەرم ناکەن

بێدەنگییا ڤی جھی یا پەڕتاندی!

....

ما مە ھەموویان چ ژێیە...

ما ڤی زەمانی چ ژێیە؟!

*

جارەکێ زارۆک بووم/

ھۆسا گۆتبوونە من..

لێ ژ نشکەکێڤە بوومە پیر..

پا کا ئەوا ل ناڤبەرا دو تەمەنان؟

بەرزە بووێ؟!

**

نەدووره پشتی دەمەکی.. زارۆکا من

دەستێ هیڤیانێ خوە ێ پێتی و خەونۆکی

بگریت و رێکێ بشەقینیت

دبیت.. ل بەر چپکێن بارانێ سەوداسەر ببن

دبیت.. جاددە ب ئاشتیێ د تەڕ بن

ئها هینگی.. زارۆکا من

نەدووره پشتی بیست ساڵان..

چەلۆژەنێ ب ریهـ بزڤڕیت!

***

٢٠٠٦

أغنية تحت المطر. من ديوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٨٥-٨٦.

## زڤستانەك

نەخێر.. نەیێ پشتڕاستم

من باوەری.. ب تشتێ ئەز دبێژم نینە

ب چ تشتێ ئەو دبێژن نینە

هەرچەندە ئەز نەرێگرێ وێ چەندێمە کو بمرم؟!

بەری کو ڤێ هەمی ڕاستییا گەنیبووی،

نووژەن بکەم؟!

نەخێر.. ژ چ تشتەکی پشتڕاست نینم

"تشت" وەرگوهێزکێن سەیرن

جیوەیینە/ هەما بێژە عەردینە

دچن و دهێن... پاشی دچن

....

خێر د پێشبینی یێن عەجێبیاندایە

پێشبینیا ئەوا چ جا نەهێت بکە:

- ڤەگەریانا ئەوی کەسێ نەڤەگەرییێت

ئەوێن مری.. یان ژی ئاخفتنا یێن مت...!

.....

دبیت یا پێدڤی بیت کو..

هەر پەرەکی ژ وان بەلگێن

مە یێن زەریوویی بگوهورین

ب سترانەکێ... سترانەکا کویڤی

ل سەرێن چیا دەنگڤەددەت و..

دخەندقیت

دناڤ مژا نهالاندا... دخەندقیت!

.....

هەروەکو دەمژمێر کۆمەک ماهینێن مرینە

دەڤ ژ شهینێ بەرنادەن

هەروەکو گولی یێن گەنمی هیڤی یێن ئەستەمینە

ب کێرناهێن کو ببنه مەی

یان قەفتەکا مشت ژ ماچان

....

هەروەک مری.. کۆمەک گولانە ژ بەفرێ

خەرییبیا وان کتیلیکێن مەستیێ دکەن

ل مەیخانەیێن کەڤنێن بەغدا

کو چارچەفێن ل سەر مێزێن وان ڕەقبووینە

ژ خوێنیا ئەشکێن ل سەر رێژتی

....

سەرمایەکە..

ب ڕەنگێ ئەمبیۆلانسان

پەمیێ نۆژداری و

دلێ دایکا من...

د سارییا سەرمایێ دپێچیت!

....

سەرمایەکە

ب ڕەنگێ پرچا ڕەسوول حەمزاتۆڤی[31] و

دوماهی گوملەکێ گاندی[32]...

سەرمایەکە ب بێهنا ڕەشاتیێ

ب هێزا بسماران و

چهگێریپا پەرجانان!!!

من ژ جیهانا ئێقینێ ڤەددزیتن!!

.....

زڤسانە...

زڤستانەکا سەرمەدییە!!

***

٢٠٠٧

شتاء. من ديوان (ناجون.. بالمصادفة- ٢٠٠٩): ص٩٥-٩٨.

---

[31] ڕەسول حەمزاتۆڤ (١٩٢٣- ٢٠٠٣): شاعرەکە ژ کۆمارا داغستان یا ئێکەتییا سوڤیەتێ، گەلەک ژ شعرێن وی بووینە ستران و کتێبا وی یا ب ناڤێ "داغستانی من" ب کوردی و عەرەبی هەیە.

[32] گاندی: موهانداس کەرمەشاند گاندی (١٨٦٩- ١٩٤٨). ڕابەرێ روحیێ بزاڤا خوەسەرییا هندستانێ بوو، ب مەهاتما گاندی دهاتە ب ناڤکرن کو ب ڕامانا "گیانێ مەزن" دهێت. وی توندوتیژی نەدپەژراند و ڕۆژەکا جیهانی ب ناڤێ "ڕۆژا جیهانییا نە توندوتیژیێ" دانا بوو.

## تەلەفۆن

تەلەفۆنێ.. ب شەڤێ غولغولەکا هەی
کەس نزانیت، ژبلی ئەوێ ژ ئەنیا شەڕی
ل نیڤە شەڤێ دگەل خاتوونا دلی دئاخڤیت.
... تەلەفۆن ب شەڤێ
من ژ ترسەکێ پڕ دکەت و
هەستەکا ب سەرمایێ و ڕویسیێ.. ددەتە من
ڕویسییەکە ل هەمبەری نۆژدارەکی
تەڤ ئەندامێن من دپشکنیت
ل سەر تەختەکی و ل ژوورەکا ڤەژاندنێ
تەڤ لایێن وێ د بۆیاغکری:
هەتا ملان ب ڕەنگێ شین
تا سەپیتکان ب ڕەنگێ سپی

ئو ب ترسەكا دژوار هەتاكو پەراسييان.

.. هژمارەكێ دخوازم و

ل لايێ دى زەنگا تەلەفۆنێ لێددەت

- چەندين سالە- يا بێ بەرسڤ

ئەز دلێ خوە د تەلەفۆنێدا دبهيسم

هەناسەيا خوە دبهيسم

ئو دەنگڤەدانا كاژێران!!

***

الهاتف. من ديوان (مزامير راكوم الدهماء وقصائد أخرى- ٢٠٠٢)؛ ص١٤-١٥.

## ئەوێ شاعر

"ستران.. ب ڤی شێوەی ڕاست نابیت"

ئو شاعر یێ بەردەوام بوو، تم دگۆت و ژێ دبرەڤە

هەر ڕێزەک.. هەر تیپەک، جاردی دوبارە دکرەڤە

جهێنیکێن خوە ب بێئۆمێدی، دگڤاشتن و قەلەم هاڤێت

دگەل خوە.. دهات و دچوو ب نیانی

گوهێن خوە ژبۆ شەڤێ و بۆ دەرگەهان ڤەدچنین

بۆ وێ ترسا کراسەک کرییە بەر جانی.

... ...

"ئاە... چەند یا دژوارە دلئێشان!"

ڕەجفکەکێ گرت و مینا تاگەرمەکێ هژاند

دناڤ تاریستانا خەمێ و بێزاریێ و هەپارەیاندا

بەرزە بوو

د دوهییەکا چوویدا.. وەکو سەرابێ بەرزە بوو

سالێن شین.. ژبێ وی دناف تۆمارەکێدا دپێچیت

"هێ.. هەی دل، من چەند ل خوە ددا بکەم

پاشی من نەکر، چ ژێ نەما بوو کو بکەم"

لێ ڕەجفیم.. شمشیرێ من کەفتە بنی و

هەروەکو شووشەی پرت پرت بوو

نێ چ نەما.. ژ بلی ئاسۆیێ جەمەدێ و

هێلینکێن بالندا، ئەوێن بەرەف زویرکا فڕین

کەسەک چ ژێ نا بهیسیت

بەس د خەونێدا، د بیرەهی و بیرهاتنانندا

د بێدەنگییا سترانانندا

ئاە.. گەر سترانێن وی زفڕیبان و زفڕیبا

ئاە ئەگەرا...

وەلێ ئەڤە گیانە.. ئەو گیانێ بووی خرابە!

***

الشاعر. من ديوان (مزامير راكوم الدهماء وقصائد أخرى- ٢٠٠٢)؛ ص٢٠-٢١.

## نەشازی

جۆرێن قەسپان نانیاسم و

چ لاڤە یێن خوە دەبارکرنێ ژبەر ناکەم.

چ ژ بهایێ دولاری نزانم و

چ ژ ئەنجامێن یاری یێن ئورۆپی،

یان رێکارێن وەغەرا بەر ب (عەممان)ڤە نزانم،

د بەرەکەتێن تۆڤێ رەشرەشکان ناگەهم،

کێشێن پشکێن ئاهێن خوارنێ ژی نزانم،

بەری جەژنێ،

قەت پرچا خوە نا تراشم

چ پویتەکێ ب تەلەفزیۆنێ نادەم و

ل چ بەهییان یان شەهیانان،

بەرهەڤ نابم.

.....

لێ هەکو فەیرۆز دبستریت،

دبەهتم...

هەکو دبینم،

کوکورسیکا هەڤالێ من.. بێ هەڤاله

دکەمە گری!

***

شنوذ. من ديوان (مزامير راكوم الدهماء وقصائد أخرى- ٢٠٠٢)؛ ص٢٢.

# بازێرێ مێشا

ل سەر شوستەیێن تۆزنێگرتی،
باوشک دهاتنه هافینێ
مێش ڤەنهیانە بازێرێ دەرگەهگرتی و
تێفە د غایچوون
کالەکێ پیرێ پشت چەمیای،
ل دانگا رێکێ روونشت و تم ب خاڤی
ئایەت ل دویف ئایەتێ دخواندن
ئو چەند سنێلەیێن پێخواس
دناف کۆلانکاندا دمەشین
د بێدەنگییێدا، د ژیرکرنێ و وونبوونێدا
خەما دجوین و مەزن دبن و ب نافسالڤە دچن
عەورەکێ لال و مشت تاری

دلێ من یێ شکەستی و دووریێچکری گڤاشت

خودێووا

کی دێ تکیتەکێ ژبۆ جیهانا فەنابوونێ فرۆشتە من؟

خودێووا

ما شاعر دێ چ کەت، ل باژێرەکێ

ل بەر کولمێن کولی و بایێ گەرم؟

مەیخانێن وی ب شووران و ب شەمایێ دائێخستی

هەیڤێن وی ب تاریستانێ وەرپێچای

ڕۆژێن وی مینا خەرافێ[33] د زڤرن و

خەلکێ وی ژی...

بەس دەنگڤەدان؟!

***

مدينة الذباب. من ديوان (مزامير راكوم الدهماء وقصائد أخرى- ٢٠٠٢)؛ ص٢٤-٢٥.

[33] خەرافە: ئاعۆر

# بەلێ

بەلێ، ئەز ئەو کویلەمە

یێ من پلاتۆ[34] ب مەستێ دسەردابری

تا ل هەمبەر من کرییە گری و

هەر تشتەک ماندلاکری: شکەفت و هەسپێ سپی[35]

میناکێ هەسپی و میناکێ سپییاتیێ

کەفتە سەر چۆکێن خوە: من بزڤرینە زارۆکییا من

---

[34] پلاتۆ (Plato): فەیلەسۆفەکێ یۆنانییە ناڤێ وی ئەرستوکلیسێ کورێ ئەرستۆنییە (٤٢٧-٣٤٧ ب. ز)، قوتابیێ سۆکراتییە و ماموستایێ ئەرستۆیە، دامەزرێنەرێ ئەکادیمیا ئەسینایە کو ئێکەمین پەیمانگەها خواندنێ بلند بوو ل جیهانا رۆژئاڤایی، وی بنەمایێن سەرەکی یێن فەلسەفا رۆژئاڤایی دانانە.

[35] ئاماژە ب وێ شکەفتێ ددەت ئەوا پلاتۆی (ئەفلاتون) بەحسکری کو مرۆڤ زیندانییەکێ قەیدکرییە د شکەفتەکێڤە و ل پشت وی ئاگرەکێ گەشە، هەمی تشتان رۆهن دکەت و سیبەرا وان دئێخیتە سەر وی دیوارێ ل بەرانبەر، ئەو تشتێن راستەڤینە نابینیت، لێ تنێ سیبەرا وان یا لڤۆک دبینیت و یا ژ ویڤە ئەون راستی. هەروەسا ئاخێ مرۆڤی ب عەرەبانەکا دو هەسپ دکێشن دشوبهینیت، ئێک سپییە و یێ دی رەشە، هاژۆیێ عەرەبانێ جڤەنگێ ئاخەکێ ژیرمەندە، ئانکو پەنوەری و ئاراستەکارییە.

من دڤێت ب پێخواسی غاردەم

من دڤێت ب سەر دارهەژیرەکێ بکەڤم

من دڤێت هنگڤینی بدزم: هنگڤینەکێ دروست،

ژ چقێن بیهۆکەکا دروست، ل دارستانەکا دروست

بەلێ ئەز بووم... ئەز بووم یێ من

جامێن مەیێ، دەپێن نڤیسینێ و

تێلێن قیسارێ و

شەربەتا شەوکەرانێ[36] بۆ وان چێکرین.

.......... بەلێ ئەزم!

***

نعم. من ديوان (مزامير راكوم الدهماء وقصائد أخرى- ٢٠٠٢)؛ ص٢٨.

---

[36] شەوکەران: شوکران ئەو ژەهرا کوژەکە ئەوا دایە سوکراتی ژبۆ ئیعدامکرنا وی.

# کی؟

کی دێ بەرەکی..

هاڤێژتە د گولا ئەڤێ ئیجماعا گەنیدا

کی دێ وەکهەڤێ خوە کوژیت؟

کی دێ گازیکەت ڤە ئەزم

پێ ڕویسم و ژ ڕویسیا خوە نا ترسم

خۆدیکا خوە نا پەرێسم

قەت نا ترسم.. ژ ڤی عەردێ هنگافتی ب ئەحمەق و

نیڤ مری یێن ل سەر خوینا خوە ب ڕێڤە دچن

وەک یاریۆکان، یان ژی پرتێن وان یێن درپای

ب خرابی کۆپیکری؟!

***

من؟ من ديوان (مزامير راكوم الدهماء وقصائد أخرى- ٢٠٠٢)؛ ص٨.

# دوماهیك ڕۆژ

ل ڕۆژەكا دوماهیێ...

ئەڤ پەردە دێ هێتە گرتن

بەری چوونێ

دەم دێ ترانا ب من كەت و

دێ كولمەكێ ل چاڤێن من دەت

ئو دێ دفنا من ژی بڕیت

چونكو دێ دەست ڤالا باركەم

ئەز دێ باركەم!

نە چقەكێ زەیتوونێیە[37] یان ئامازەك،

ژبۆ عەردی من ڤێ نینە، هەڤالینۆ

---

[37] چقێ زەیتوونێ مە ل جهێ (سعفة ) دانایە، مەرەم پێ (سعفة النخیل)ە كو ژبۆ پێشوازیكرنێ یان خاترخواستنێ دهێتە بكارئینان. دبێژن دەمێ مەسیح چوویە ئۆرشەلیم، خەلكی ب سەعفەیا دارقەسپێ پێشوازی لێ كربوو.

ئەم دێ بەرەف تەقنێ و ئاڤێ و...

ئەلندا سەرمەدی زڤڕین

ما دێ هزرێ د هندەک سترانێن نوودا کەین؟

یان دێ ل سەر کوندکان ڕوونێین[38]

ئو بەهیا ڤی سەردەمی دانێین!

....

هۆ هەڤالۆ.. ئەڤە دەمێ وەغەرێ هات

مژەکێ ژ دویکێلا خوە هەلمژە

بەس مژەکێ ژ وی بایێ خوە یێ ب قەحبەییێ داگرتی،

هەلبمژە و پاشی هەرە..

نێ مزگینی د برویسییاندا خویا بوو!

***

النهار الأخير. من ديوان (النهار الاخير- ٢٠٠٠)، ص٦-٧.

---

[38] ڕوونشتنا ل سەر کوندکان: مە ژێ پەیڤا (تقمي) ئینانیە کو د بنەرەتدا بۆ صەیان بکار دهێت دەمێ پی یێن خوە ل سەر عەردی موکم دکەن و ل سەر کوریا خوە دڕوونێن.

## هەلبەستا ڕۆژئاڤابوونێ

ڕۆژەکا درێژ دبۆریت و تو یا دووری

مینا دەمێ زارۆکینیێ و تەڤی بیرهاتنێن کەڤن

تو یا دووری..

یا نێزیکی... گەلەک نێزیک

وەک خەما من، وەک سترانا من یا داخدار.

...

دوهی ب شەڤێ من خەونەکا ب تەڤە دیتی:

ئەم ب تنێ بووین..

ئێڤارێ ژی، تەنگەزارە ستێرێن خوە ڤێددان

من تو داخوازکرییە سەمایێ/

دزانم من.. پێنگاڤێن خوە ژبیرکرینە

لێ ل وی دەمی

من دڤیا دەستێن خوە ل دۆر تە بئالینم

من دڤیا ل نێزیکی من بی

ب ڕەخ دلیڤە.. دناڤ پشێن مندا بنڤی

لێ تە چ کارڤەدان نەبوو..

تو د خەونێدا یا پێتی بووی

نە تە ڕەتکر، نە ڕازی بووی

تە گۆت: هەڤالێ تە، یێ ژ بنداڤێ دەرئێخستی

پاشی تو ب مژداری کەنی!

ڤێ کەنینێ...

دەنگڤەدانەک ب ژان هەبوو، وەک نالینێ

ما تو دگریای.. یان دکەنی؟

ئەز پرت پرت بووم/ دەنگێ وی دێوێ ئاسمانی

هشیارکرم و من گۆتە خوە:

ئەڤە زستانێ دەستپێکر!

ئو من گوهێن خوە ڤەدچنین:

چریورییەک و... نالینا پەڤینەکا دوور!

ئەرێ تو دزانی خانمێ.. ئەی خانما بەندەمانێ

کو هەکو ئێڤارا گەمژە ڤەدگەرپێتن

ئەز بەرەف خەونێفە درەڤیم

وەلێ نهۆ یێ بەرزە بوویم

ژێ هشیاری و خەوا من، ئەشکەنجەدانە و مرنە

لەرزکا ترسەکێیە و زیڤالێن رۆناهییەکێ!

.........

.........

زڤستانێ زوو دەستپێکر

ئاڤابوونەک ب رەنگێ خوینا ڤیژاندییە

رەهەندێ و سترانێن کوشتی و هیڤییان دگریت

ئەڤجا رابە وەرە... دێ وەرە

دا مێژە و گریا خوە..

دا شەمالکا خوە یا لەرزۆک

دگەل تە هەڤپشککەم!

***

قصيدة الغروب. من ديوان (النهار الاخير- ٢٠٠٠)، ص٨-١٠.

# دەپێن ئەنلیل

## خەونا نڤیسەرەکێ ژ ئەنفەرا[39]

**دەپێ ئێکێ:**

ئەڤ شەڤە دێ شەڤبێرێ دگەل ئەنلیل[40] کەم

بەری نهۆ داخواز کربووم، لێ نەچوو بووم

پێ بێتاقەت یان شەرمین بووم- نزانم...

ئەڤ شەڤە ئەز دناڤ ئاسمانەکێ چۆل ڕا

بەر ب مەلەکۆتێ بلندترینڤە ڕاکێشام

---

[39] ئەنفەر: بازێرکەکێ دێرینێ دڤەرێن فوراتا ناڤەڕاستییە دگۆتنێ "نیبرۆ"، پەرسگەها ئەنلیلی لێ بوو. ڕامانا ناڤێ وێ ئەوە کو خەلکێ وێ بلەز بەر ب ڤەرێڤە یان هەر کارەکێ گرنگێ دیڤە دچن. نهۆ ناحیەکە ژ قەزا عەفەک، سەر ب پارێزگەها زیڤارڤەیە.

[40] د میتولۆژیا میزوپۆتامیادا، ئەنلیل ژ جووتبوونا ئان (خوداڤەندێ ئاسمانی) و کی (خوداڤەندا عەردی) دبیت. ئەو بلندترین خوداڤەندێ سۆمەرییانە، پەرسگەها وی "ئیکۆر" ل بازێرێ (ئەنفەر)ە. خوداڤەندێ با و باڕۆڤییە، چارەنڤیسێ مرۆڤان د دەستدایە، ئەوە مەلیکێ ددەتە وی کەسێ ئەو هەلدبژێریت، ئەوە خێرێ و شەڕی ددەتە مرۆڤان و ئەوە یێ تۆفان هنارتی.

فریشتەکێ/ پۆلیسەکێ برمە د ژوورڤە

مەدالییا سەرکەفتنا ل سەر (تەیمات)ێ[41]،

ب هەردو شاپەڕێن ویڤە دتەییسی و

کرمە د ئەیوانا مەزنڤە

ئەو ل وێرێ بوو..

ل دوورترین کوژێێ هۆلێ

ل سەر عەرشێ دارئەبنۆسێ ڕەش،

ڕوونشتی بوو

هەر دەملدەست وی هەست ب ترسیانا من کر

وی نێزیکی خوە کرم و

تەنا کرم..

هەمی ترسا من ڤەڕەڤاند

من ب ئارامی هەناسە دا و بێهنا من هات.

---

[41] تیامات خوداڤەندا ئاڤا شۆر و دایکا خوداڤەندانە. ل دەف بابلییان مەردۆخ ل جهێ ئەنلیل هاتییە دانان، مەردۆخ ڕکابەرییا تیاماتێ دکەت و دشەڕەکێ تەحل و درێژدا سەرکەفتنێ ب دەستڤە دئینیت و لەشێ وێ دکەتە دوو قەت. لێ بەری بمریت ئەو ئەژدیها و هۆڤان بەردەتە وەلاتێ دناڤبەرا دو ڕووباراندا.

دەپێ دووێ:

ئەنلیلی ئەز داخوازکرمە سەترنجانێ

ب ساناهی من ددۆرپینیت

قەبێ وی دخوازم و جارەکا دی من ددۆرپینیت

ب من دکەنیت و چاڤێ خوە ل من دنقینیت

ما تو نزانی کورێ من...

چەندین چەرخن ڤێ یاریێ دکەم

مرۆڤێن فانی بەیدەقن

شاهێن وێ وەرەقن

پف دکەمێ و کەنگی من دڤێت، ڤەدگوهێزم..

داکو دفنا پەریشانان پێ بشکێنم؟!

**دەپێ سیێ:**

ئەنلیل پرسیارێن ل سەر مەیێ ژ من دکەت

شیرەت دکەم: زۆر ڤەنەخۆ!

مە یا زانی- تو بەرپرسێ ڤان کەونانی

گەر تە ڤەخوار، بلا جاما تە پەمبی بیت

داکو هەکو گەرمیبا وێ ل تە زەبیری و

تە ژ بێزاری- بەر ب سەرێن مەڤە هاڤێت

دا پێ نەشکێن!

**دەپێ چوارێ:**

.. ئەو پرسیارا وەلاتێ من، ژ من دکەت:

ڕەوشا وارێ تە چاوایە، ئەوێ دبێژنێ..

ئەوێ دبێژنێ.. ئاه.. هەی ژیرکرن

(فریشتەکێ زێدە ب توورە، پستەپستەک د گوهیدا کر)

ئاه.. هاتە بیرا من

وەلاتێ شاعرێن هەردەم ئالۆز

واریٚ دارقەسپان و هەڤشیێ ئاگری

ئەڤە چەندین چەرخن من ج ژ هەوە نەبهیستییە

ئەریٚ ما هێشتا هوون...

زەقۆرەیان ژ پێخەمەتی من ئاڤا دکەن؟!

- !!..

پرسیار ژ من دکەت کا تا نهۆ

خەلک تاعەتی و نڤێژان دکەن؟

ئەز ژی درەوا دکەم:

- هندەک ژیٚ.. هەمیا دلۆڤانییا وە دڤێت

..... .......

- هەی درەوین!

(زەلامەکیٚ شێست سالی یێ ل رەخیٚ راستیٚ ژ عەرشی

روونشتییە و ل من دقیژینیت

چەند نێرینێن ئاگر ژیٚ دچیت، ل من دبارینیت!!

..... .......

بێدەنگ دبیت، ژیٚ دپرسم:

- ببوورە ما تو کیی؟!

ئەو دەنگێ من نابهیسیت

دبیتە پەیکەر،

پاشی مینا شەماڵکێ دحەلیێت و

چ شوونپێ ل پاش وی نامینن

ئەنلیل.. مەندەهۆشیێ د چاڤێن مندا دخوینیت

فەرمانێ ددەت، وی دیمەنی ژێبر بکەم

هاویش دبم و سەرێ خوە بۆ وی دچەمینم!

دەپێ پێنجێ:

ئەڤ شەڤە مێڤانێ منی

بەری بچی، هەمی داخوازی یێن خوە بێژە

تە چ دڤێتن، بێ شەرمینی.. داخواز بکە

تە ماڵ دڤێت، مولک، پەری

تە مەی دڤێت.. قاپێن زێری...

- سوپاس ئەنلیلێ مەزندە

ل من ببەخشە..

من چ نەڤێت و چ تشتان داخواز ناکەم

یا من دڤێت، بەس بەرسڤا

پرسیارەکا حەیراندیم:

ژبۆ چ بوو تە عەبدێن خوە ئافراندین؟

بۆچی تە کرنە میللەت و ژن و زەلام؟

بۆچی تە هندەک ئازاد دان، هندەک کویلە؟

ئەرێ بۆچی تو بلند دکەی و نزم دکەی،

ددەی، دستینی،

نێزیک دکەی، دوور دکەی،

دهەرێفی، دنژنی؟...

پرسیارا من- نە ژبێزارییێیە، حاشا-

بەلکو من دڤێت د مەرەما تشتان بگەهم!

ئەنلیلی ب درێژی هزرا خوە کر

دەستێ خوە ب ڕیهێن پیرۆزدا دئینا خوار:

هۆ کورێ من..

تە ناخێ من پڕ کۆڤان کر

تە ئاگرەک دناڤ دلێ مندا هەلکر

پیراتیێ ل بن خۆلییا دوبارەبوونێ دپەچنیت

کورێ منۆ..

تو ب پرسا ڕازا ڕازان ژ من دکەی

ئەوێ ڕازا ئانۆ[42]، یان ئەنکی[43] نزانیت

تو پرسیارا ڕازەکێ دکەی

خۆ ئەوێ تو ل حەزرەتا وی ژی نزانیت

ئەنلیل ژی نزانیت!!

***

الواح أنليل: رؤيا كاتب من نفر. من ديوان (النهار الاخير- ٢٠٠٠)، ص١٦-٢١.

---

[42] ئانۆ، ئان: ئاسمانە یان خوداڤەندێ ئاسمانییە د میتولۆژیا میزوپۆتامیادا، پەرسگەها وی "ئیانا" ل باژێرێ (ئوروک) بوو.

[43] ئینکی، ئەنکی: خوداڤەندا ئاڤا شرین بوو پاشی دبیتە خوداڤەندا هەمی ئاڤێ و دەریایێن ئاڤا بن عەرد، پەرسگەها وی "ئاپزۆ" ل باژێرێ (ئەریدۆ) بوو.

## سترانا چلساڵیێ

ئەڤە بۆ ئێڤار و...

هێشتا ئەز ڕێ پێنگاڤێن خوە

د مەوکبێ فەنابوونێدا ڕادکێشم.

هەیهۆ سنێلاتیبا منێ

ب خێروخۆشی.. خوداحافیزیێ ل تە دکەم

ب خەم و بخوور و خەنایێ..

خوداحافیزیێ ل تە دکەم.

...

هێشتا تو هەر یا دەستڤەددەی

ئەی تەڤ ڕۆژان و تەڤ دەمژمێران

هێشتا دچییە د کووراتیبا،

سەقەم و ڤالاهیێدا... شێتییێدا

ئەی لەشفرۆشا هێژ کچین

هەر یا دچی و تەڤ سیبەرێن خوە یێن گران

ژ سەر جاددەیێن مشتی تاریستان ڕادکێشی

تە.. چەندین جاران ڤێژی ڤەددان

دگریای، دکەنی.. پستەپستەک

ب لەعنەتا بارکرنێ دکر

چەندین نانێن د خوینێ هەلدای

تە ژ مەمکێن لاوازێن خوە دخوارا

...

هەیهۆ سالان

ئەی ئەو رەڤدا هەسپێن حێنجێن،

ژ تەولخانا ئاسمانی ڤەڕستی

ئەی دێمێ (میدۆزا)[44]یێ و

---

[44] میدۆزا، میدۆسا: کەساتییەکا ئەفسانەییە د ئاشۆپا گەلێ گریکیدا، ئەو ژنا جوانە کو ئەسینایێ لەعنەت لێ باراندین و داڤێن پرچا وێ کرینە مار و کرێت کری، ژبەرکو ل پەرسگەهێ کریارا سێکسیی ل گەل بوسایدۆن کریوو، ڤێ لەعنەتێ وە لێ کر بوو کو هەر کەسێ بەرێ خوە بدەتێ ببیتە بەر. ئالکو ئامارژییە بۆ تشابەتییا خوەییتیا وێ و بەر بوون ژی ئامارژییە ژبۆ

هەنسکا (عەشتەرۆت)[45]ێ

ئەی ئەوگولا یێ بێهن دکەتێ دخەندقینیت

ئەی ئەو عەورێ فەنابوونێ دبارینیت

ئەی زارۆکا لەیلان شیری ددەتێ

ئەی لڤینا خورتا ئەلهۆیان

ئەی سێدارەیێن لەیستۆکان و

ئەی... باوشکێن گۆڕان!

...

خودانا مەیخانێ[46]، ئەی زانایا نهێنییان

دێ چەوا شێم ستێران گرم؟

---

نەبوونا شیانێن ڤەبوولکرنا خومییتیێ ب شێومیەکێ بابەتییانە. سەربڕینا وێ دبیتە ئەگەرێ ژ دایکبوونا خریسا کو جەڤەنگێ گیانییە و بیفاسۆس کو جەڤەنگێ خوە بلند دیتنێیە.

[45] عەشتەرۆت (Astrate): خوداڤەنداندا پیتی و ئەڤینیێ و جەنگێیە ل دەڤ فینەڤی و کەنعانییان، بابلی دبێژنێ عەشتار و ڤەرتاجی دبێژنێ تانیت و ل دەڤ گریکان ژێ ئەفرۆدیت و هیرا و سیبیلە.

[46] خودانا مەیخانێ: مەرەم (سیدۆری)یە، کەسایەتییەکا داستانییە د داستانا (گلگامش)دا، خودانا مەیخانەکێیە و پەنوەرییەکا ئاهۆرایی هەیە، هەوڵدا گلگامشی ژ لێگەڕیانا وی یا ل نەمریێ پاشگەز بکەت و ئارمانجا وی بکەتە خوشی یێن ژیانەکا ساکار و هەچکوهەیی، لێ د سەر ڤێ چەندێ را ژێ، هاریکارییا وی دکەت کو ل سەر ئاستەنگێن د ڕێکا لێگەڕیانا ویدا زاڵ ببیت.

دێ چەوا شێم د دۆزەخێ ڕا بۆرم دا نەمریێ،

ژ باخچەیێن خوداڤەندان بچنم و

دارێن مێوان ل بازێرێ خوە بچینم؟

نێ زەنلێن من دبڕینە... تشابەتن؟!

خاتوونا من...

پەیاپەیا ناڤ و وەرزان قەرماندم

قەنتەرەیێن بەرزەبوونێ..

من ل سەر ملێن خوە هەلگرتن

هەتاکو بوویمە چلسالی

من گازیکر... ئەی هۆ ئاسمان

ئەی عەرد، ئەی رووبار، ئەی توخیب، گەلی کەڤران

هندەکێ ژ یا تە ژ من ستاندی بزڤرینەڤە

یان ژێ پەردێ ژ سەر یاریا گەمژە لادە!

***

أغنية الأربعين. من ديوان (النهار الاخير- ٢٠٠٠)، ص٢٣-٢٥.

## بەخچەیێ شێتییێ

بەخچەیێ گونەهان و ئێشانێ و شێتییێ

بەخچەیێ پێشەمانیێ.

ئەو بەخچەیێ دارێن وی خرش

بەرهەمێ وی هەپارە

ئاخا وی.. ئاڤا وی.. ئاسمانێ وی،

بشکۆژک و چقێن وی.. تۆزوبا!!

......     ......

بەخچەیەکە...

هەر ژ ئەلندێ و هەتا قیامەتا تشتان

هزار هزار تەڤران لێددەن

لێ یێ خرشە، خرابەیە.. چۆلە

نە هەنگەک ل دۆر دزڤڕیت، نە پەروانەک

نه شاعرەک پێ شەیدا دبیت، نه فڕندەک

چ عاشق لێ، نامیننه ل بەندا دیدارێ!

.....     .......

بەخچەیەکه تەڤ لەعنەتان دکەته باران

بەخچەیێ تاعۆنێ و پڕ ئاه و فیغان

بەخچەیەکه پەرجانێ وی،

پێ داردەستێ وێرانیێ بووی!

بەخچەیێ ڕەشەیان و دزیکەران

بەخچەیێ هەپارەیان و گومانان

بەخچەیەکه ناتۆرڤانێ وی سەوداسەر

دگەل دوپیشکێن زەر دنڤیت و گۆنێ دکەت

بەخچەیێ خوینێ!

***

حديقة الجنون. من ديوان (النهار الاخير- ٢٠٠٠)، ص٢٩-٣٠.

# ئاهەنگ

د مەها لەززەتێن سۆتیدا

دێ بەرخەکێ ڕەش ڤەکوژم

دێ ژ پەرسگەها مەردۆخ[47] دزم

ئو ژبۆ حازۆکان برێژم..

ل سەر ئاگرێ دارێن کوژیان

دێ شەرابا سەتمینا د سەرداچوویی ڤەخۆم و

پێکێن ڤهێتییا ڤشارا توند، دێ ب پەیاپەی داگرم

زەلال... مینا ئاییردەیێن مرنێ،

ل دەف قەهرەمانێن سامۆرای[48]

---

[47] مەردۆخ، مەردۆک: خوداڤەندێ نەتەوەیێ بابلییانە، پاشی دبیتە سەرۆکێ هەموو خوداڤەندان و ل بەرانبەری ئەنلیل دهێتە دانان، پەرسگەها وی ل (بابل) بوو.

دێ گوشتێ خوە کەمە خوارنا صەیێن ڕێکا

دێ دەرکەڤمە بەر ڕەشەبایەک زەیری و

دێ ڤیژینم:

هەوێر هەوێر.. ژبۆ قەلەڕەشکا ئەبەدی

هەوێر هەوێر.. ژبۆ تۆفانی!

***

أحتفال. من ديوان (النهار الاخير- ٢٠٠٠)، ص٤٢.

[48] سامۆرای: تەخەکا شەرڤانێن پایەبەرزە ل ژاپۆنێ، ب هندەک ئاییردمێن تایبەت ب شەڕی و ژیانێ و مرنێڤە د ناڤدارن. ب نەمازیی ئاییردمێ خومکوشتنێ پشتی کو بەرناتاڤی شکەستنەکێ یان هێتییەکێ دبن.

## خەون

ڕۆژەکا خۆش و گەشە.

سوپاس خودێ!

پا دا خەونێن خوە ییێن کەڤن

ئەوێن ڕزیێ دادایێ!

ل سەر حەوالا ماڵا خوە یا هەڕفتە بڕائێخم

ل ڤان نێزیکان

دێ پۆلیسێ دێم هشکێ شارەوانیێ هێت

چ؟

ئەڤرۆکە یێ مۆلەتداییە؟

گەلەک سوپاس ژبۆ خودێ!

ئەڤجا ئەز دێ هەتا نیڤرۆ

ل بەر هەتاڤێ ڕائێخم!!

***

أحلام. من ديوان (النهار الاخير- ٢٠٠٠)، ص٥٦.

# ئەرێ ل بیرا تەیە؟

ئەرێ ل بیرا تەیە؟

هەکو ئەم پێکڤە..

ل داوی ڕۆژا سالا بهێت!

تە گۆت: من ماچی بکە

لێ ئەز.. ب ماچیکرنا تەڤە

یێ مژوولبووم!

دەمێ من گریا تە دیتی

من دانا ماچا بهەژمێرم

هەکو سالا بۆری دهێت!

داکو بیرا تە لێ بینم

ئێک.. دو،

ئێک.. دو، ئێک.. ئێک،

... ئێک!

وەستیانێ ئەز د خوە پێچام و

من بڕیار دا ب ئێکەم ماچێ

ئەز بێهنا خوە ڤەدەم..!

***

هل تذكرين. من ديوان (النهار الاخير- ٢٠٠٠)، ص٥٧.

# پێرست


| | |
|---|---|
| پێشگۆتن | ٥ |
| من بزڤڕینە گەنجاتیا من | ٩ |
| سترانەک د قاییشا سەکەراتێڤە | ١١ |
| سترانەک ژبۆ خودانێن سەرێن ڕەش | ١٣ |
| خوەکوشتن | ١٥ |
| وەلاتەک ژ بارانێ دترسیت | ١٧ |
| بالۆرەیەک ژبۆ دیوارێ بەری | ٢١ |
| شیرەتا وی کالێ هەردو پێ بری | ٢٣ |
| هایکۆیێن پاییزی | ٢٥ |
| ئەگەر من ماف هەبا.. بەهەشتا خوە بهەلبژێرم | ٢٩ |
| گرنژینا وێ زارۆکا کوورە | ٣٢ |
| دێ من کیڤە بەن؟ | ٣٣ |
| ئەو ئەوە یێ دیتی | ٣٥ |
| خڕخڕا ئۆدیسیۆسی | ٣٧ |
| نەخێر.. نە ئەوم یێ تو هزر دکەی | ٤١ |
| کورسیکەک ل ناڤ بەفرێ | ٤٣ |
| ژ ڤێ گەشبینیێ بێزارم | ٤٤ |
| سترانا زارۆکێ ئەبەدی | ٤٦ |
| بۆچی نانڤی؟ | ٥٠ |
| سترانەک ژبۆ یەهوەی | ٥٣ |
| یێ کورد بکوژن | ٥٥ |
| فیساگۆرس.. ژ من ڤەبە | ٥٩ |
| بۆچی ژ بەهەشتێ دترسم! | ٦١ |
| وەلات | ٦٣ |
| کوشتنا شاعرەکی | ٦٥ |
| ئێڤاری باش ئەی هەڤالۆ | ٦٧ |
| ژبۆ پەسنداریيا دون کیشۆت | ٦٩ |
| سوحبەتێن گیرۆبوويی یێن سولەیمانی | ٧٢ |
| پاییز | ٧٩ |

| | |
|---|---|
| سترانا ڤالانتاینا بچووک | ٨١ |
| لاڤەیەک.. یان بەهەشتا کەسێ کورد | ٨٣ |
| ژبەر ڤێیە حەز ژ شەڕان ناکەم | ٨٦ |
| سێلفییەک دگەل تەرمێن دژمنێن خوە | ٨٩ |
| جەنگ | ٩٢ |
| بارانەک.. ل هنداڤ شنگالێ | ٩٣ |
| سەر | ٩٥ |
| زولەیخا | ١٠٠ |
| چەند شیرەتەک بۆ هاملێت! | ١٠٢ |
| ئەی وێنەگر.. وێنەگرێ پیرێ مەیخانێ | ١٠٤ |
| گزیرتەیا ژبیرکرنێ | ١٠٦ |
| ئەوێن ڕزگاربووی ب سودفە | ١٠٩ |
| د خلوەتگەها خوەڤە "هەلبەستێن هایکۆ" | ١١١ |
| ئو ل داویێ | ١١٥ |
| سترانەک ل بەر بارانێ | ١١٧ |
| زڤستانەک | ١١٩ |
| تەلەفۆن | ١٢٣ |
| ئەوێ شاعر | ١٢٥ |
| نەشازی | ١٢٧ |
| باژێرێ مێشا | ١٢٩ |
| بەلێ | ١٣١ |
| کی؟ | ١٣٣ |
| دوماهیک ڕۆژ | ١٣٤ |
| هەڵبەستا ڕۆژئاڤابوونێ | ١٣٦ |
| دەپێن ئەنلیل خەونا نڤیسەرەکێ ژ (نەفەر) | ١٣٩ |
| سترانا چلساڵیێ | ١٤٧ |
| بەخچەیێ شێتیێ | ١٥١ |
| ئاهەنگ | ١٥٣ |
| خەون | ١٥٥ |
| ئەرێ ل بیرا تەیە؟ | ١٥٦ |

## ماجد الحيدر



ل سالا (١٩٦٠)ێ ل بازێرێ بەغدا ژ دایكبوویە. باوەرناما نۆژداریيا ددانا، ل سالا (١٩٨٤)ێ، ژ زانینگەها بەغدا وەرگرتییە. شاعر و چیرۆكنڤیس و وەرگێرە ژ هەردو زمانێن كوردی و ئینگلیزی بۆ سەر زمانێ عەرەبی. ژ بەرهەمێن وی یێن چاپكری:

1. النهار الأخير. شعر. بغداد- 2000.
2. في ظل ليمونة. قصص قصيرة. بغداد- 2001.
3. ماذا يأكل الأغنياء. قصص قصيرة. بغداد- 2002.
4. مزامير راكوم الدهماء وقصائد أخرى. شعر. بغداد- 2002.
5. نشيد الحرية وقصائد أخرى لشيللي. ترجمة. بغداد- 2004.
6. الإيدز بين المناعة والفيروس. طب. بغداد- 2004.
7. عبور الحاجز. شعر عالمي، ترجمة. بغداد- 2007.
8. ناجون بالمصادفة. شعر. دهوك- 2009.
9. ضحك كالبكاء. كتابات ساخرة. بغداد- 2010.

10. الثلج والنار والأغنيات. شعر كوردي، ترجمة. بغداد- 2010.
11. مالاني. قصص باللغة الكوردية. دهوك- 2012.
12. The Psalms of Rakoom the Black and other poems. Proclaim Press, Pittsburgh- PA, USA.
13. Yes, It's Me. Selected poems. Duhok- 2014.
14. في الذكرى السنوية لرحيلي. قصص. بغداد- 2014.
15. غلطة من هذه؟ شعر. دهوك- 2015.
16. ستأخذنا الريح. 101 قصيدة من الشعر النسوي العالمي. ترجمة. دمشق-2016.
17. الملاك الألثغ الصغير. قصص. دمشق- 2016.
18. مؤيد طيب. قصائد مختارة. شعر كوردي مترجم. دهوك- 2016.
19. يهودا عميخاى- الله شفيق بأطفال الروضة وقصائد أخرى. شعر مترجم. بلجيكا- 2018.
20. كفّ عنّي يا فيثاغورس. شعر. دهوك- 2019.
21. لا ريح تقلني، لا أرض تحملني. شعر كوردي مترجم. عمان- 2020.
22. أمي تذهب الى الجنة. مختارات من شعر قوبادي جليزادة. شعر. السليمانية- 2021.
23. حكايات الموقد الخشبي. حكايات من الفولكلور الكوردي. دهوك- 2022.
24. بلاد تخاف المطر. شعر. بغداد- 2022.
25. بنسيون الربوة العالية. قصص مترجمة للقاص إسماعيل هاجاني. بغداد- 2022.
26. أسطورة الخلق. قصص وأساطير عالمية. بغداد- 2022.
27. العنب المّر. قصص من بلاد الكورد. ترجمة. بغداد- 2023.

